حکومەتــا هەرێما کوردستــانێ – عیراق

وەزارەتا پەروەردێ

ڕێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# ئابووری

## بۆ پۆلا یازدێ ئامادەیی ویژەیی


دانان

د. محمد سلمان محمد

هاتییە کرمانجیکرن ژ لایێ

قیس صباح حمید

لشکر حاجي محمد طاهر　　　　کروان مصطفی مصطفی

پێداچوونا زمانی

محمد عبدالله أحمد

پێداچوونا زانستی

لشکر حاجي محمد طاهر



چاپا سێیێ　　٢٧١٥ کوردی　　٢٠١٥ زایینی　　١٤٣٦ مشەختی

# پێشگۆتن

مل بمل دگەل وان گوهۆرینێن دسەرجەم بیاڤێن ژیانێ دا، ل هەرێما کوردستانێ ڤەگرتین بۆ بەرەف ژیانەکا باشتر، و بەرفرەهکرنا رەوشەنبیریێ کو پێنگاڤەکا ڤی کاروانییە، پێدڤییە گوهۆرین ژی دپرۆگرامان و سیستەمێ خواندنێدا بهێتە کرن، هەتا بگەهیتە ئاستێ پێش ڤەبرنا هزرا جیهانی و هەتا کو ژوێ گوهۆرینا بلەزا جیهانی و جیهانیبوونێ نەهێینە دابرین و ژ تێگەهێن ئازادی یا بازاری بێ بەهر نەبین، لسەر راسپاردا وەزارەتا پەروەردا هەرێما کوردستانێ لژنەکا بسپۆر ژ رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنیان رابوون ب دانانا ئەڤێ کتێبێ. دڤێ پەرتووکێدا ئەوا لبەرچاڤ هاتیە وەرگرتن کو پشکا ئێکێ دووبارەکرن و بەرەف پێشڤەبرنا ئەوان هزر و بوچوون و بابەتان بیت کو ل پۆلا چارێ هاتینە خواندن، و پشکێن دیژی بگونجن دگەل ئاستێ تێگەهشتنا ئەڤێ قوناغا خواندنێ، و دگەل ئەڤان ئارمانجان:

-تێگەهشتن و ئاسۆیێ هزرا فێرخوازان دبیاڤێ ئابووریدا بەرفرەهتر بکەت.

- سیاسەتا پەروەردەیی ل هەرێما کوردستانێ دڤێت گوهۆرینێ ل زانستێ پەروەردەیی بینیتە گۆرێ، ئەو گوهۆرین ژی مل بملێ وان پێشڤەچوونا بیت کو گازی بۆ بهێتە کرن.

زێدەباری وێژی دگەل وێ رەوشا هزرییا ئەڤرۆ ل جیهانێ هەی بتایبەتی دبوارێن ئابووریدا، بۆ ئاراستەکرنا وێ بەرەف ئابوورەکێ ئازاد، ورێکخستنا کەرتێ گشتی و جیهانگیری و میکانزمێن وی، هەرچ دڤێ پەرتووکێدا هاتییە

بشێوەیەکێ پێگڤە گرێدایە و هەڤگونجینەك دناڤبەرا بابەتاندا هاتیە دانان هەتا وەکو بگونجیت دگەل ئاستێ زانستی و هزریێ قوتابیان.

هیڤیدارم ئەڤ پەرتووکە دەسپێکەکا ب مفا بیت کو ژ لایێ بسپۆرێن کورد ڤە پێشکێشی فێرخوازان و پرۆسێسا خواندنێ کریە، و پشکدارییەکا باش بیت د بەرەڤ پێشڤەبرنا پرۆسێسا پەروەردەیی و رەوشەنبیریا کوردستانێ و گەشەپێدانا بوارێ زانستی بۆ هندێ ل ئاستێ گوهۆرینێن جیهانێ بیت.

ل داویێ هیڤی دکەین دڤی کارێ خۆدا ئەم دسەرکەفتیبین و خزمەتەك مە گەهاندبیتە پرۆسێسا خواندنێ، سوپاسیا وان هەمی کەسان ژی دکەین کو ب رەخنە و پێشنیارێن بنەجە و ئاڤاکەر تێبینیێن خۆ لسەر ڤێ پەرتووکێ دەرببرن، دئەنجامدا دێ بیتە ئەگەرێ کێمکرنا خەلەتیان و کێموکاسییان.

# پشكا ئێكێ
# پێداچوونەكا گشتی
# REVIEW

## ئێك :

## پێناسینا زانستێ ئابووری و هەڤبەندییا وی ب زانستێن دیتر ڤە و گرنگیا وی :

### ١- پێناسا زانستێ ئابووری

### The Defination of Economics

زانستێ ئابووری (Economics) ئێكە ژ زانستێن جڤاكی كو ب شێوەكێ سەرەكی پویتەی بوان رێكا ددەت یێن كو جڤاك دەستنیشان دكەت بۆ بكارئینانا ژێدەرێن سنووردارێن وی، كو بكارئینانا جهگرتی هەبیت ژ بۆ بەرهەمئینانا (شمەك) و خزمەتگوزارییێن بكاربەرێن نهۆ و پاشەرۆژێ.

-لڤێرە پرسیارەك دهێتە پێش، ئەرێ ئابووری زانستە یان هونەرە؟

-زانست پێكهاتییە ژ كەلەكبوون (كەفتنە سەرئێك) و پولینكرن و رێكخستنا زانیارییان ژ بۆ ڤەدیتنا بنەمایێن سەرەكی و كارێ یاسایان.

- بەلێ هونەر ئاماژەكرنە بۆ شیانا یان بەهرەمندییا بجهئینانا ئەركان یان پراكتیزەكرنا شێوازەكی. لەورا ئابووری گرنگیێ ددەتە پێشكەفتنا زانستییا نە یا بنەمایێن ئابووری و پراكتیكێن (بجهئینانا) وی چاواتییا

چارەسەرکرنا وان ئاستەنگێن کو دکەتواریدا (واقع) هەنە. ب رامانەکا دی ئابووری زانست و هونەرە، ژ بەر کو سەرەدەریێ دگەل چالاکیێن جڤاکی دکەت، لەورا زانستەکێ کومەلاتییە (جڤاکی یە) و هەڤبەندیا وی ب زانستێن کومەلایەتی و رەفتاریڤە هەیە وەکو زانستێن دیرۆك و ڕامیاری و زانستێن دەروننناسی و کومەلناسی.

**زانستێ ئابووری گەلەك پێناسە هەنە، دێ ئاماژێ ب هندەك ژ وان دەین:**

❖ ئەو زانستە یێ کو ل دابەشکرنا دەرامەتێن کێم هەیی ڤەدکۆلیت دناڤبەرا بکارئینانێ و ئارمانجێن جۆرا و جۆردا.

❖ ڤەکۆلینێ دکەت دەربارەی رەفتارا مرۆڤی دماوێ ئەنجامدانا چالاکیێن خۆ یێن ژیانا رۆژانەدا بۆ دەستەبەرکرنا پێدڤیێن خۆ ب ئارمانجا دەستڤەئینانا ژیانەکا خۆش.

❖ زانستەکە ل شێوازێ زێدەکرنا بەرهەمئینانێ ڤەدکۆلیت ب ئارمانجا باشکرنا ئاستێ ژیارێ.

ئەڤ پێناسێن لسەری هەر ئێك ژوان ئاماژە ب تشتەکێ دیارکری دکەت، بەلێ هەر هەمی پێکڤە وێ نیشانددەن کو زانستێ ئابووری:

أ- زانستەکە گرنگیێ ددەتە دەرامەتان و کێم هەبوونا وان. ئەڤ دەرامەتێن کێم هەیی ژی هەمی پێدڤیێن مرۆڤی پرناکەن. لەورا پێدڤییە جڤاك دەست بسەر وان دەرامەتان بگریت، و ئابووریناسان گرنگیێ ب وان جهگرتیان (Alternatives) ددەن لجهێ ڤان دەرامەتان دهێنە بکارئینان و ڤەدیتنا وان رێکا کو جڤاك لداویێ هەلدبژێریت بۆ بکارئینانا وان دەرامەتێن بەردەستێن هەیی.

ب- هەر وەسا رێكێ ددەتە تاكە كەسان دسەربەست بن دچاواتیا دابەشكرن و بكارئینانا دەرامەتاندا لەورا پێدڤییە لسەر وان، ئەوان شمەكان ( شمەك) هەلبژێرن كو دڤێن ب دەسهاتێن خۆ بگرن. و چاوانیا بكارئینانا دەمێن خۆ و هژمارا زارۆیێن خۆ و تشتێن دی. بیاڤێ هندێ بۆ ئابوورناسان هاتە رەخساندن (بەرهەڤكرن) كو گرنگیێ ب وان رێكخراوێن ئابووریێن جودا بدەن و پویتەی ب رۆلێ حكومەتێ دئابووریدا بدەن دبن سیبەرا سیسستەمێن جودادا.

## ٢- پەیوەندییا زانستێ ئابووری ب زانستێن دیڤە :

زانستێ ئابەووری زانستەكێ كومەلا یەتییە دپێشڤەچوونا خۆدا پشت ب زانستێن رویت گرێ ددەت ( العلوم الصرفة).
بڤی رەنگێ خارێ دێ بەحسێ هەڤبەندییا زانستێ ئابووری دگەل هندەك زانستێن دیتر كەین:

### أ-پەیوەندیا ئابووری ب دیرۆكێ ڤە:

دیرۆكا روویدانێن ئابووری ددەمێ بۆریدا رێخوشكەربوویە ل بەردەم ڤەگۆلەرێن ئابووری بۆ لێكۆلینێ دروویدانێن ئابووریێن هەڤچەرخدا و لدەمێ ڤەكۆلینێ دەربارەی دیرۆكا ئابووری و ئاگەهداربوون لسەر گەشەبوونا ڤان روویدانێن ئابووریێن كو ددەمێ بوریدا هەبووینە، ئەوە كو دشێین ل چاوانییا دیاردا ئابوورییا هەڤچەرخ تێبگەهین.

## ب-پەیوەندییا ئابووری ب زانستێ ڕامیاریڤە:

ڕامیاری هونەرێ حوکمرانی یە. یان ئامرازەکە بۆ ڕێکخستنا پەیوەندیێن دناڤبەرا دەولەت و هاڤولاتیان دناڤبەرا دەسەلاتداران و بێ دەسەلاتان، بیرو بۆچوونێن هندەکا ددەربارێ ئابووری ئەوە کو ئابووری پێدڤییە دخزمەتا ڕامیاری دا بیت ئانکو سامانێ نەتەوەیی و لڤینێن ئابووری پێدڤی یە دخزمەتا دەسەلاتێ دا بیت، هەتا کو ددەستپێکێ ژی دا پێناسا ئابووری ب (زانستێ ئابوورێ سیاسی) دهاتە نیاسین. ئەڤ پێکڤەگرێدانا ئابووری ب ڕامیاریڤە بەلگەیەکێ ڕوونە لسەر پەیوەندییا موکوما ڕامیاری ب ئابووریڤە.

## ج-پەیوەندییا ئابووری ب زانستێ دەروونناسی ڤە:

پالدەرێن دەروونی یێن ڤەشارتی ڕەفتارێن مرۆڤی دیار دکەن، بەلێ ئابووریناس پویتەی ب زانینانا چەوانییا ڕەفتارا تاکە کەسی ددەت و خەرجکرن و هەلبژارتنا تشتاندا. لەورا پێدڤی یە پشت بهێتە گرێدان ب دەرۆنزانیێ ژ پێخەمەت شرۆڤەکرنا ڕەفتارێن مرۆڤی دچالاکیێن ئابووریدا و پێشبینی کرن ژ ڕەفتارێن ئایندەیدا، بۆ نموونە هۆکارێن دەروونی کاردکەنە سەر بەرهەمئینانا کرێکاری و شیانا وی د پشکداریکرنێ د بەرهەئینانێدا. لەورا دشێن بێژین پەیوەندییەکا ب هێز هەیە دناڤبەرا دەروونزانی و زانستێ ئابووریدا.

### د-پەیوەندییا ئابووری ب زانستێ یاسایێ ڤە:

ئابووری بنیاتێ جڤاکێ مرۆڤایەتێیە و یاسا ژی چارچوڤێ رێکخستنا وی یە، لەورا پێدڤی یە رێسایەکا یاسایی یا پێشکەفتی هەبیت بۆ رێکخستنا مامەلێن شارستانی و بازرگانی و ئابووری ژ پێخەمەت پاراستنا بەرژەوەندیێن گشتی بۆ هندێ دا مل ب مل بیت دگەل پێشکەفتنێن ئابووری پێدڤی یە دچارچوڤێ یاساییدا بهێتە راستڤەکرن و هەر وەسا یاسا کار دکەتە سەر چالاکیا ئابووری، هندی دەڤێن یاسایێ دنەرم بن دێ هاریکاریا پرکرنا یێن پێدڤی گەشەکرنا ئابووری کەت، هەر لسەر ڤێ دیتنێ پێدڤی یە دارێژەرێن یاسایی شارەزایی د بارودۆخێ ئابووریێ گشتی و پێدڤی یێن جڤاکیدا هەبیت.

### هـ-پەیوەندییا ئابووری ب زانستێ ماتماتیکێ (بیرکاری) ڤە:

بیرکاری د ئابووریێ هەڤچەرخدا گرنگی و پوویتەکێ زۆر پێ دهێتە دان. ب تایبەتی پشتی کو ئابوورناس (جۆن مایتاردکینز JohnMyuerdKeynes) شیای پێشکەفتنێ د ب کارئینانا بیرکاریێ د ئابوریدا ب دەستڤەبینت کو بوویە ئەگەرێ ئینانا شێوازێن پێشکەفتی د زانستێ ئابووریێ هەڤچەرخدا. ئەڤ گرنگییا زۆر کو دایە بیرکاریێ دبواریێ ئابووریدا دگەل قوتابخانا بیرکاریێ سەرهلدا بۆ ڤەکولینێ ل سەر کەرتێن ئابووری یێن بەرنیاس بکارهێنەرێ بەرهەمئێن Input-output models و هەر وەسا سەرهلدانا ئابووریێ ماتماتیکێ بۆ خستەڕوویا (پەیداکرنا)پەیوەندییان ب شێوێ گوهۆرینان (Variables) و هاوکێشان (Equations) کو ئەڤ گوهۆرینە گرێداینە ب دارشتنا شێوازەکێ (الصیغ) (Formula) بیرکاری یێ ڕاست و دروستدا.

## و-پەیوەندییا ئابووری ب زانستێ ئامارێڤە (سەرژمێرییێ ڤە) (الأحصاء):

ئامار دەربرینا هژمارێ یە بۆ زانیاریان، نەخشەدانانا ئابووری ب پلا ئێکێ پشت ب زانیارییێن ئاماری دهێتە گرێدان خشتێن ئامارێ بابەتەکێ سەرەکی یە دپرۆسا نەخشەدانان و شرۆڤەکرنا (Analses) ئابوری دا، ب تایبەتی پیڤان ب رادەکێ زۆر پشت ب ئامارێ دئێتە گرێدان، د ڤێرێدا دیار دبیت کو پەیوەندییەکا موکم دناڤبەرا ئامار و ئابوورێدا هەیە.

## ز-پەیوەندییا ئابووری ب زانستێ ژمێریارێڤە:

زانستێ ژمێریاری ل تێگەهێن یێن پێدڤی دروستکرنا زانیارییێن دارایی تایبەت ب پرۆژەی ڤە دکولێت. دروستکرنا زانیاریان پێکهاتییە ژ کریارا پیڤانێ و تۆمار و شرۆڤەکرن و کورت کرنێ و پشتی هینگێ خستنەروویا ڤان ئەنجاما بۆ وان کەسێن کو ل دەف وان یا گرنگە و مفای ژ ڤان زانیارییان وەردگرت، کو ئەوژی خودان پروژێن ب رێڤەبرنێنە و بەلێندەر و دەولەتن.

## ح-پەیوەندییا ئابووری ب زانستێ رێڤەبرنێ ڤە:

کارگێری ب هەمی لەقێن خۆڤە پەیوەندی ب ئابوورێڤە هەیە.چۆنکی زانستێ ب رێڤەبرنا بەرهەمئینانێ گرنگییێ ب پراکتێزەکرنا (تطبیق) بنەمایێن زانستی ددەت د رێڤەبرنا کارێن بەرهەمئینانێدا و هەر وەسا زانستێ

ب رێڤەبرنا فرۆشتنان گرنگیێ ب پراکتێزەکرنا بنەماییێن زانستییێن ب رێڤەبرنێ ددەت دکریارێن فرۆشتنێدا هەر وەسا زانستێ بو بازاربرنێ (التسویق Marketing) بنەماییێن زانستێ ب رێڤەبرنێ دبیاڤێ کارێن وان بۆ بازار برنێ پراکتیز دکەت. و زانستێ بۆ بازار برنێ ژ چەند لقان پێك دئێت ژ وانا ب رێڤەبرنا فرۆشتنان (المبیعات Sells) و رێکلام (الأعلان Advertising) و بازرگانیا کەت و کۆم کو ب شێوەکێ راستەوخۆ و نە راستەوخۆگرێدایینە ب زانستێ ئابووری ڤە. پێدڤی ب هەبوونا ڤان زانستان دگەل بەرپابوونا شۆرشا پیشەسازی و پێشکەفتنا جڤاکان ژ لایێ ئابووریڤە دەرکەفت.

## ی-پەیوەندییا ئابووری ب زانستێ ڕەوشتیڤە (الاخلاق):

نابیت زانستێ ئابووری یێ دویر بیت ژ ڕەوشت و زانستێ ڕەوشتی. ڕەوشتێن پیشەیی حوکمی د چالاکییێن ئابووریدا دکەت ل هەمی کەرتاندا د ڤێرەدا ب دەسکەفتێ ڕەوا و نەڕەوا هەیە ژ لایەنێ ڕەوشتیدا، هەر چەندە زانستێ ئابووری ژ سیستەمێ ئابووریێ سەرمایەدارییێدا ژ بۆ زالبوون ب سەر ئەو ئاستەنگێن ئابووری کو روویبروی وان دبیت بێ ڤەگەراندن بۆ ژەهو ریشالێن ڕەوشتی و موکومکرنا لایەنێ ڕەوشتی د چالاکیا ئابووریدا.

## دوو : هزرا ئابووری :

ل وی دەمێ مرۆڤ ل سەر ڤی ئەردی هاتیە دیتن هەست ب دوو راستیێن گرنگ کریە کو ئەڤەنە:

راستیا ئێکێ: پێدڤی یێن ژیانا مرۆڤی دزۆرن.

راستیا دووێ: ئەو دەرامەت و سامانێ دسروشتیدا هەی، ئەگەر دگەل وان پێدڤی یێن زۆر کو مرۆڤی هەین هەڤبر بکەین، وان هەمی پێدڤی یێن وان پڕ ناکەت.

دەمێ ڤان هەردوو راستیا پێکڤە گرێدین کێشە و دیاردێن ئابووری دێ سەرهلدەن، مرۆڤی هەردەم هەولدایە ژ وان هێزا تێبگەهت کو ئەو دیاردێن ئابووری برێڤە دبت و کاریگەری ل سەر هەیە. و هەر وەسا هەولدایە پەیوەندیێ دناڤبەرا ڤان هێزا و دیاردێن ئابووری دشێوێ یاسایەکا زانستی یا گشتی دا دا برێژت کو کار دکەتە سەر.

## دیرۆکا هزرا ئابووری:

ڤەکۆلین دەربارەێ پێشڤەچوونا هزرا ئابووری گرێدایە ب ڤەدیتن و دیارکرنا وان یاسایان کو کارتێکرنێ ل سەر دیاردێن ئابووری دکەن، و هەر وەسا ئەو سیاسەت ژی کو پێدڤی یە بهێتە پەیرەوکرن و ئەو سیستەمێ ئابووری ژی کو کار پێ دئێتە کرن.

ئێك ژ ئەرکێن سەرەکی یێن زانستێ ئابووری ڤەکۆلین و ڕوونکرنا رێکێن جودا جودانە کو دهێتە کرن بەرسڤا پرسیارێن وان (کیژکن؟ و چەوا؟ و بۆ کیرێ؟) بدەت. جڤاکێن جودا جودا و لدویف سیستەمێ

ئابوورییێن هەلبژادی هاتینە رێکخستن. زانستێن ئابووری ڤەکۆلینێ ل بارێ میکانزمێن جودا جودا دکەت کو دبیتن جڤاکەك بکاربینیت بۆ دابەشکرنا دەرامەتێن سنووردارێن خۆ.

بۆ ڤێ مەرەمێ ژی سێ رێکێن سەرەکی هەنە بۆ بەرهەم ئینانێ:

رێکا ئێکێ: رێکا بەرهەمئێنانا سەرمایەداری

رێکا دووێ: رێکا بەرهەمئێنانا سوشیالستی

رێکا سێیێ: رێکا بەرهەمئێنانا تێکەل

و ئەڤ رێکە ژی ل سەر چەند پیڤەرەکێن جودا هاتینە دامەزراندن کو ئەو ژی ئەڤەنە:

١-مولکداریا هێزێن بەرهەم ئینانێ.

٢-ڕۆلێ هێزێن جڤاکی و دارایی د بەرهەم ئینانێ دا.

٣-ژ لایێ دابەشکرنا کومەلایەتی بۆ بەرهەمی.

دڤان داویان دا شێوازێن دی یێن جۆرا و جۆرێن رێکێن بەرهەم ئینانێ ل چوار چوڤێ پەیوەندییێن بەرهەم ئینانێ و پێکڤە گرێدانێ ل سەر ولاتان سەرهلدا:

-ژ هەمیا گرنگتر پڕۆژێ نیڤ دەولەتی یان فرە ڕەگەزە. کو رێکا بەرهەم ئینانا سەرمایەداری (پرۆژێ فرە ڕەگەز) سەرکەفتیبوون ل دەست ب سەر داگرتنا جیهانی ب رێکا لڤینا سەرمایێن ژ دەرڤە

ب شێوەکی بوویە ب سیستەمێ ئابووریێ پێنجێ کو ئەڤەژی جۆرەکێ نۆیە ل دابەش بوونا کارێ نیڤ دەولەتی دیار دکەت.

ئەو پێنج سیستەمێن ئابووری کو دشێین ل بیاڤێ ئابووریێ هەڤچەرخ دا بهێنە پەیرەوکرن ئەڤەنە:

## ١- سیستەمێ ئابووریێ سەرمایەداری

## Capitalism Economic System

ئەڤی سیستەمی کومەکا تایەتمەندیا (سالوخەتا): (Characteristics) تایبەتێن خۆ هەنە ژ ڤان ژی:

### أ-ئارامانج (قازانج): The Targetor Goal (Profit)

مەرەما سەرەکی ل سیستەمێ سەرمایەداری ژ هزرا تاکە کەسی دا دەردکەڤیت و یا گرێدایە ب لایێ دەروونێ کەسی بخۆڤە، ژ لایێ حەزێ هەولددەت بۆ بدەستڤەئینانا وی ڕادێ قازانج و تێربوونێ ب شێوەکێ دی ب دەست ئینانا نەختینەی چۆنکی مامەلەکرن ل چوار چوڤێ پێ گوهۆرێ نەختینەی، ئەو ژی ل بن سیبەرا پێشبرکێ و لایەنگریا ڕێنمایێن ئابووری ژ لایێ کەسێ ئابووری، چ ئەڤە ل قوناغا بەرهەم ئێنانێ بیت یان بکاربرنێ.

### ب-مولکداریا تایبەت یا بنەمایێن بەرهەم ئێنانێ:

هێزێن بەرهەهێنن ماددی تاکە کەس خودانێ وێ یە (سەرمایێ سەرمادارن و ڕێکخەران، سامانێن سروشتی و کەرەستێن خاڤ بۆ خودانێن وان، زەڤی بۆ جوتیاران و هێزا کاری بۆ کرێکاران) هەر ئێك ژ وان ئەوێ هەی پێشکێشی

ئەوێ دی دکەت بۆ تەمامکرنا کریارا بەرهەم ئینانێ بەرامبەر خەلاتەکێ دیارکری: مفا و قازانج بۆ سەرمایەداران و ڕێکخەران، بهایێ سامانێن سروشتی و کەرستان بۆ خودانێن وان، کرێ بۆ کرێکاران. ئانکو بنەمایێ یاسایێ بۆ سێستەمێ سەرمایەداری ب خۆ ژ مافێ مولکداریێ یە (الملكية) ژ لایەکی و پەیوەندیێن گرێبەستان (العقود) ژ لایەکێ دیڤە دیار دکەت.

ج-کریارا بەرهەم ئێنانێ و دابەشکرن (التوزيع): د سێستەمێ سەرمایەداری دا ب شێوەکێ سروشتی و خورستیی ب رێکا میکانزما نرخی و د رێکا هێزا بازاری دا دهێتە ئەنجام دان چۆنکی د بازارێ سەرمایەداری دا (میکانزما نرخی) دبیتە ئەگەرێ ئێکگرتنا (حەزا ب کاربەران) و (حەزا بەرهەم هێن و وەبەرهێنان) چۆنکی دەمی ب کار بەر داخازا شمەکەکی (تشتەکی) دکەن ئانکو بکاربرنا (بکارئینانا) ئەوی شمەکی زێدە بیت دێ نرخێ ئەوێ شمەکی بلند دبیت. و بەرهەم هێنانا وی جۆرێ شمەکی (قازانجەکێ) زۆر ژێ دەست دکەڤیت ئەڤە ژی (سەرمایەداران) و (ڕێکخەران) هان ددەت وی جۆرێ شمەکی بەرهەم بینن د قوناغا دووێ دا بەرهەم هێنانا وی شمەکی دبازاری دا زێدە دبیت و نرخێ وی دهێتە خوارێ ئانکو خالا ئێکتر بڕینێ خواست و خستەروو دروست دبیت ب ڕامانەکا دی ل وێ خالا خواست و خستەروو ئێك و دوو دبڕن خالا هەڤسەنگیا وی شمەکی یە.

حەزا بکاربەران ← خواستی دیار دکەت

حەزا بەرهەم ئینان ← خستەرووی دیار دکەت




### د-ئابوورىٚ بازارى : Market Economy

كريارا بەرهەم هێنانىٚ و دابەشكرن (التوزيع) د سيستەمىٚ سەرمايەدارى دا ب رێكا سروشتى و خورستى ب رێكا ميكانزما نرخى (بهاى) و ب رێكا هێزا بازارى دهێتە ئەنجام دان. هەر دوو هزر ژى تەمامكەرێن ئێك و دوونە، نرخ ڕۆلەكىٚ سەرەكى دبينيت دكريارا دابينكرن و دابەشكرنا سامانێن (مرۆڤى و ماددى) ل ناڤبەرا ب كاربەرێن جودا جودا دا بەلىٚ ئەڤ نرخىٚ كو پێك دهێن ب ئەركێن خۆ ڕادبيت دبازارى دا بوريە.

### ٢- سيستەمىٚ ئابووريىٚ سوشياليستى ( ئاڕاستەكرن يان پلانسازى ): ( Planned or Directed ( Socialist Economic

دبن سيبەرا ڤى سيستەمى دا سەرجەم بريارێن كو گرێداينە ب بەرهەم ئينانىٚ و دابەشكرنىٚ ژ لايىٚ ميرى ڤە (الحكومة) دهێنە دان، و دئابووريىٚ ئاراستەكرى دا ميرى خودان پڕانيا هۆكارێن بەرهەم هێنانىٚ يە (ئەرد و

و سەرمایە) خودان و ئاراستەکەرێ کارێ پڕانیا دەزگەهانە و کاری بۆ کرێکاران دابین دکەت و دبێژیتێ چاوا کارێن خۆ ئەنجام بدەن و هەر وەسا بڕیارێ ل سەر چاوانیا دابەشکرنا بەرهەمێن جڤاکی ددەت ل سەر هەمی شمەك و خزمەت گوزارییان. ب کورتی دئابوورێ ئاڕاستەکری دا میری بەرسڤا پڕانیا پرسیارێن سەرەکیێن ئابووری ب رێکا مولکداریا وێ بۆ دەرامەتان و ب رێکا شیانێن وی ل سەر چەسپاندنا وان بریارێن خۆ ددەت.

## ٣- سیستەمێ ئابوورێ تێکەل Mixed Economic System

سیستەمەکێ ناڤنجیە و هەمی خەسلەت د باش و پوزەتیڤێن سیستەمێ سەرمایەداری و سوشیالستی ب خۆ ڤەدگریت و هەول ددەت ژ کێم و کاسیان دوور بیت، دەولەت دجودانە دپەیرەوکرنا ڤی سیستەمی ل ڕادێ کومکرنا خەسلەتێن هەر دوو سیستەمان، هندەك ژ سیستەمێن تێکەل پوتەکێ زۆر دایە ب خەسلەتێن سیستەمێ سەرمایەداری، هندەك ژی پویتەکێ زۆر دایە ب خەسلەتێن سوشیالیزمی.

بڤی شێوەی هندەك سیستەمێن ئابوورێ تێکەل پەیدابووینە ب سیما و ئاراستێ سەرمایەداری یان سیمایێ سیستەمێ ئابوورییێ سوشیالیست ب خۆڤە دگریت

## چالاكيا ئابووريیا دەولەتێ دسیستەمێ ئابووریێ تێكەل دا ئەڤ ئەركێن لخارێ هەنە:

١-دابینكرنا بنەمایێن یاسایی بۆ كاركرنا دەزگەهێ نرخی.

٢-پارێزگاریكرن ل هەڤركیێ (المنافسة).

٣-تمامكرن و برێكخستنا كارێ دەزگەهێ نرخی.

٤-نەهێلانا ئەو بێكاری و هەلاوسانا كو ژ دەرئەنجامێ بارگوهۆرینێن ئابووری (الدورات الاقتصادية) سەرهلددەن.

## ساخلەتێن ئابوورێ تێكەل:

١- هەبوونا كەرتێ گشتی (القطاع العام) مل بملێ كەرتێ تایبەت (القطاع الخاص).

٢-هەبوونا پلاندانانێ یان ئاراستەكرنێ ژ لایێ میری ڤە.

٣-دانانا چاڤدێریێ ژ لایێ دەولەتێ ڤە لسەر كەرتێ تایبەت.

٤-هاریكاری و بیمەیا (التأمين) دەولەتێ دبەرژەوەندییا كاری و كرێكاران دا دژی بێكاریێ.

٥-دانانا سنۆرەكی (توخیبەكێ) بۆ قورخكاریێ (الأحتكار).

## سێ: چالاكییێن ئابووری: Economic Activities

### ١- بەرهەمئینان: Prudution

پێكهاتییه ژ كریارا گوهۆرینا بەردەواما هێزێن سروشتی و ماددی كو نەشێن ئێكسەر پێدڤییێن مرۆڤی پڕ بكەن، كو مرۆڤ دگوهۆریت بۆ شمەك و خزمەتگوزارییان كو وەسا دشێین پێدڤییێن مرۆڤی پێ پڕ بكەین. ئانكو بەرهەمئینان كریارەكە مفای پەیدا دكەت یان زێدە دكەت.

### ٢- دابەشكرن: Distribution

پەیوەندییا مرۆڤییە دگەل وان كەسێن كو دجڤاكیدا دگەل واندا دژین و كو پشكداریا ئێك و دوو دكەن دكریارا بەرهەمئینانێدا و وان دەرئەنجامان ژی كو ژ ئەگەرێ وێ پشكداریكرنێ پەیدابیت د بدەستڤەئینانا بسپۆریێ و كار دابەشكرنێ و دابەشكرنا بەرهەمێن جڤاكی لسەر ئەو كەسێن كو پشكداری دچالاكیێن ئابووریدا كریە و لسەر ئەو كەسێن كو پشكدار ژی نەبووین.

### ٣- ئالگۆڕی ( پێكگوهۆرین ): Exchange

ئانكو ڤەگوهاستنا كارگێریێ بۆ ملكداریا شمەك و خزمەتگوزاریان كو دچالاكیێن ئابووریدا هاتینە بدەستڤەئینان، هەر وەكی بازرگانیا ناڤخۆ و بازرگانیا دەرڤە نموونە نە بۆ ئەڤی جۆرێ پێكگوهۆرینێ.

### ٤- بكاربرن: Consuming

كریارا بەرهەمڤكرنا دەرامەتانە بۆ بكاربرنا كت و كۆمان و پڕ كرنا پێدڤییێن مرۆڤی و پالدەر و هۆكار و رەفتارێن جڤاكی كو بووینە ئەگەرێ زێدەبوونا هەبوونا مەزاختنێن بكار برنێ.

## بنەمایێن بەرهەمئینانێ
## FACTORS OF PRODUCTION

ئەو ئامرازن کو برێکا وان پرۆژان ئەرکێن خۆ برێڤە دبەن. ب رامانەکا دی (هەمی ئەو تشتن کو پشکدار دبن دکریارا بەرهەمئینانێدا).

بنەمایێن بەرهەمئینانێ ئەڤەنە:

### ١- ئەرد ( دەرامەتێن خورست ): Natural Resources ( Land )

پێکهاتییە ژ سەرجەم (هەمی) ئەو دەرامەت و کەرەستێن دسروشتیدا هەین. هەر وەسا هەمی تشتێن سەر ئەردی و ئەو دەرامەتێن ماددی ژی ڤەدگریت کو لسەر هەنە. و هەر وەسا ژی هەر چار رەخ و ڕوویێن ئەردی ڤەدگریت. (محیط الأرض) ئەرد بنەمایەکێ گرنگە، چۆنکی بنەمایەکێ سەرەکییە بۆ بەرهەمئینانێ و لسەر وێ کریارێن بەرهەمئینانێ دهێنە ئەنجامدان.

### ٢- کار ( دەرامەتێن مرۆڤی ): Human Resources ( Labour )

**کار:** چالاکییەکا (بزاڤەکا) هشیارانەیا مرۆڤی یە ب مەرەما هندێ دهێتە ئەنجامدان کو مفایەکێ بگەهینیت یان مفایەکی زێدە بکەت.

**یان پێکهاتییە** ژ چالاکییەکا گران و نەچارییا مرۆڤی و ب زێدەرێ بەرهەمئینانا جڤاکی دهێتە هژمارتن.

ژ بۆ هندێ کو کارکرنێ رامەنەکا ئابووری هەبیت پێدڤییە مەرجە تێدا بن:

أ-ئەڤ هەولا دهێتە ئەنجامدان ژ لایێ مرۆڤی ڤە بیت.

ب-ب حەز و ئارەزوبیت (الرغبة - Desire) نە بخورتی بیت، وەکو سوخرە پێکرن.

ج-کەسەکێ ژیرمەند (ئاقلدار) وی کاری ئەنجام بدەت، بۆ رابوورین و دەم بوراندنێ نەبیت.

د-ببیتە جهێ دروستبوونا یان زێدەبوونا مفای (المنفعة).

## ٣- سەرمایە : Capital

ئامرازەکێ بەرهەمئینانێ یە کو بمەرەما بکاربرنا ئێکسەر بکار ناهێت، بەلکو پشکداریێ دکەت دبەرهەمئینانا شمەکێن دیدا، دشێین سەرمایەی دابەش بکەین بۆ دو جۆران:

أ-سەرمایێ نەختینەیی و سەرمایێ راستەقینە.
Monetary and real Capital

ب-سەرمایێ بەرهەمئینی و سەرمایێ دەسهات.

## ٤- رێکخستن : Organization Enterpreneur

جۆرەکێ تایبەتە ژ چالاکیا مرۆڤی هندەك جاران دبن ناڤێ (کار) ی دا دهێتە دانان بەلێ تایبەتمەندیێن خۆ هەنە. ئاماژە ژی ب گرنگیا کۆمکرنا بنەمایێن دییێن بەرهەمئینانی دکەت کو (ئەرد، کار، سەرمایە) و بکارئینانا وان دکریارا بەرهەمئینانێدا، و بریار دان بۆ ئەنجامدانا ئەڤێ کریارێ و مەترسیێن بجهئینانا وی ب ستۆخۆڤە دگریت. رێکخەر ئەو کەس نینە کو بتنێ ئەرکێ برێڤەبرنا وی پرۆژەی پێ سپاردبیت (دابیتێ)، بەلکو

ئەو پێشرەوە کو هەمی بەهرەمەندی و شیانێن خۆ دخزمەتا وی پرۆژەیدا دمەزێخیت ژ بۆ گەشەپێدانا وی ئەو ژی برێکا بەرهەمئینانا شمەکێ نۆی یان بکارئینانا رێکا تەکنولۆجی یا نۆی دبەرهەمئینانێدا.

## چار: پێدڤییاتی (الحاجات): Wants Needs

پێدڤی (الحاجة): حەزەکە ژ بۆ بدەستڤەئینانا ئەوان ئامرازێن کو دپێدڤینە بۆ مانا مرۆڤییان ژ بۆ پاراستنا وی بێی کو بدەستکەفتنا ئەڤان هۆیان ڤەیی گرێدای بیت، بەلێ زانیاریێن مرۆڤی وە دکەن ئەوان مەرەما بزانی کو هەولا بدەستڤەئینانا وان ددەت و ئەوان رێك و شێوازانژی بزانیت کو رێکێ بۆ بدەسکەفتنا ئەڤێ مەرەمێ ددەت.

**پێدڤی، هەر جۆرەك بیت سێ بنەما هەنە، کو ئەڤەنە:**

١-هەستکرن ب ئێش و ئازارێ وەك (برساتی، تێنیبوون) بۆ نموونە.

٢-زانینا ئامرازەکێ بۆ نەهێلانا یان بنبرکرنا وێ ئازارێ.

٣- حەز بۆ بکارئینانا ئەڤی ئامرازی بمەرەما نەهێلانا هەستکرن ب وێ ئازارێ.

## پرسیارێن پشکا ئێکێ

پ[1]/ ئەڤان زاراڤێن خارێ پێناسە بکە:

(زانستێ ئابووری، دیرۆکا هزرا ئابووری، کار، سەرمایە، ڕێکخستن، پێدڤی، پێکگوهۆرین)

پ[2]/ بەرسڤا ئەڤان پرسیارێن خارێ بدە:

١-ئەرێ ئابووری زانستە یان هونەرە؟

٢-هەڤبەندییا دناڤبەرا زانستێ ئابووری و زانستێن دی (هەر زانستەك بتنێ).

٣-ئەو لایەن چنە کو هزرا ئابووری لسەر هاتییە دامەزراندن؟

٤-بەحسێ ڕێکێن سەرەکیێن بەرهەمئینانێ بکە.

٥- ئەو هۆکار چنە کو وەکری ولات بهێتە دابەشکرن بۆ ولاتێن پێشکەفتی ژ لایێ ئابووری ڤە و ولاتێن گەشەکری؟

٦-تایبەتمەندیێن سیستەمێ ئابوورێ سەرمایەداری بەحس بکە.

٧-بەحسێ سیستەمێ ئابووری یێ سۆشیالیستی بکە.

٨-بەحسێ سیستەمێ ئابووری یێ تێکەل بکە.

٩-ئەرکێ چالاکیێن ئابووری لبن سیبەرا سیستەمێ ئابووریێ تێکەل بکە.

١٠-تایبەتمەندیێن سیستەمێ ئابووریێ تێکەل بەحس بکە.

١١-چالاکیێن ئابووری چنە؟ بهژمێرە و بەحس بکە.

١٢-بنەمایێن بەرهەمئینانێ دیار بکە و شرۆڤە بکە.

١٣-ئەو بنەما چنە کو رامانەکا ئابووری ددەنە (کار) ی؟

١٤-سەرمایە دهێتە دابەشکرن بۆ چەند جۆرەکان، بەحس بکە.

١٥-بەحس ژ ڕێکخستنێ بکە وەك هۆکارەکێ بەرهەمئینانێ.

١٦-بنەمایێن پێدڤییا مرۆڤی چنە؟

## ژێدەرێن پشکا ئێکێ

١- بول أ- ساموبلسون و ويليام د. نورد هاوس، الاقتصاد الطبعة الخامسة عشرة، ترجمة: هشام عبدالله، الاهلية للنشر و التوزيع، عمان، ٢٠٠١.

٢- د. حسين عمر، مقدمة في علم الاقتصاد: نظرية القيمة، الطبعة السادسة، دار الشروق، جدة، ١٩٨٢.

٣- عبدالكريم كامل عبدالكاظم، النظم الاقتصادية المقارنة، جامعة الموصل، مديرية دار الكتب للطباعة و النشر، الموصل، ١٩٨٨.

٤- د. مصطفى رشدي شيحة، علم القتصاد من خلال التحليل الجزئي، الدار الجامعية، الاسكندرية، ١٩٨٦.

٥- د. كريم مهدي الحسناوي، مبادئ العلم الاقتصاد، جامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٩.

٦- لبيب شقير، تاريخ الفكر الاقتصادي، مطبعة النهضة مصر، القاهرة، ١٩٧٨.

٧- د. محسن كاظم، تاريخ الفكر الاقتصادي، لبتداءَ بنشاته وانتهاءَ بالماركسية، الطبعة الاولى، ذات السلاسل، الكويت، ١٩٨٩.

٨- عبدالقادر محمد عبدالقادر عطية، التحليل الاقتصادي الجزئي بين النظرية و التطبيق، الدار الجامعية، الاسكندرية، ٢٠٠٥.

٩- د. محمد علي اليثي و د. عبدالرحمن يسري احمد، مقدمة في علم الاقتصاد: الاقتصاد الجزئي، الجزء الاول، الدار الجامعية، الاسكندرية، ١٩٨٧.

١٠-د. علي يوسف خليفة و د. احمد زبير جعاطة، النظرية الاقتصادية، التحليل الاقتصادي الجزئيظن دون ناشر، دون مكان، دون تاريخ.

١١- د. رضا صاحب ابو حمد و د. مؤيد عبدالحسين الفضل، اساسيات اقتصاديات الاعمال، الطبعة الاولى، دار المناهج للنشر و توزيع، عمان، ٢٠٠٣.

١٢-د. صبحي تادرس قريصة و د. اسماعيل محمد هشام و د. محمد عبدالعزيز عجمية، مقدمة في الاقتصاد، دار الجامعات المصرية، الاسكندرية، ١٩٧٦.

١٣- د. محمد صالح القريشي و د. ناظم محمد نوري الشمري، مبادئ علم الاقتصاد، جامعة الموصل، دار الكتب للطباعة و النشر، الموصل، ١٩٩٣.

١٤- د. كامل البكري، الاقتصاد التجميعي، مؤسسة شباب الجامعة للطباعة و النشر، الاسكندرية، ١٩٨٥.

١٥- سوزان لي، ابجدية علم الاقتصاد، ترجمة: خضر نصار، مركز الكتب الاردني عمان ١٩٨٨.

١٦- يوسف كامل محمد، فقه الاقتصادي السوق، النشاط الخاص، الطبعة الثالثة، دار النشر للجامعات، القاهرة، ١٩٩٨.

17- Micheal A. Leeds, Peter Von Allen & Richard C. Schiming," Econo – mics", Pearson Education Inc, Boston, 2006.

18- Jeffrey M. Perloff," Microeconomics", Fourth Edition, Pearson Int,l Edition, Boston, 2007.

19- Robert J. Gordon, "Macroeconomics", 10th Edition, Pearson Inc, New York, 2006.

20- Stanly L. Brue & Campbell, "Essentials Of Economics", McGraw – Hill Inc, Boston, 2007.

21- Damodar N. Gujarati, "Essentials of Economics", Third Edition, McGraw – Hill Inc, Boston, 2006.

22- Stephen L. Slavin, "Economics", 8th Edition, McGraw – Hill, New York, 2008.

23- Bradley R. Schiller, "The Microeconomic Today", 10th Edition, McGraw – hill, Boston, 2006.

24- Bradly R. Schiller, "The Macroeconomics Today", 10th Edition, McGraw – Hill, Boston, 2006.

25- Dvid D. Friedman, "Price Theory", 2nd Edition, South – Western Publishing Co, 1990.

# پشکا دووێ

## بها و نرخ

## VALUE AND THE PRICE

### بهایێ بکارئینانێ و بهایێ پێکگوهۆرینێ

### Value in use and value in exchange

هەر شمکەکێ ئابووری بیت (ئانکو مرۆڤی رۆلێ خۆ هەبیت دبەرهەمئینانا ویدا) یان یێ سەربخۆبیت (ئانکو د سروشتیدا هەبیت) بهایەکێ بکارئینانێ (Value in use) هەیە، و مەرەم ژ بهایێ بکائینانێ: (شیانا شمکەکێ کو پێدڤیێن راستەوخوییێن مروڤی پربکەت، برامانەکا دی بهایێ بکارئینانێ ئەو مفایە کو دەرئەنجامێ بکارئینانا شمکەکییە). و ژبەر کو بهایێ بکارئینانێ هەر بتنێ شمکەێن (ئابووری ڤە ناگربیت، بەلکو شمکێن نە ئابووری ژی ڤە دگریت) ئەڤ بهایە پێدڤی ب بازاری یان ئالۆگۆرییا بازاری ژ لایێ تاکە کەسان ڤە نینە.
مەرەم ژ بهایێ پێکگوهۆرینێ (القيمة التبادلية) (Value in exchanye) (شیانا شمەکەکییە کو ب گوهوری دگەل شمەکەکێ دی کوتایبەتمەندییا خۆ هەیە و جودایە ژ تایبەتمەندییێن شمەکێ ئێکێ). لڤێرە بهایێ پێکگوهۆرینێ ب خۆ د پەیوەندییەکا رێژەیی دا (العلاقة الكمية) دیاردکەت ئانکو ئەو رێژا کو شمەکەك ب شمەکەکێ دی دهێتە گوهۆریین.

بهایێ پێکگوهۆرینێ ب بەروڤاژییا بهایێ بکارئینانێ یە کو بتنێ پەیوەندی ب شمەکێن ئابووریڤە هەیە، و پێکهاتییە ژ بهایەکێ جڤاکی، چونکی بهایێ پێکگوهۆرینێ هەبوونا خۆ نینە بێی هەبوونا تاکە کەسان کو شمەکێن ئابووری بەرهەم دئینن و دبازاریدا دئێخنە رووی (پەیدا دکەن) ب مەرەما پێکگوهۆرینا وان.

## بهایێ پێکگوهۆرینێ و نرخی
## Value in Exchange and price

تێگەهێ بهایێ پێکگوهۆرینێ یێ گرێدایە ب هەڤبەرکرن یان ب پەیوەندییا دناڤبەرا برێن تێکگۆهورینێ دناڤبەرا دوو تشتێن جودا جودا، بۆ نموونە دشێین بەحسێ بهایێ پێکگوهۆرینا شمەکەکی بۆ نموونە زێر ڕێژەکا پێکگوهۆرینێ ب شمەکەکێدی بۆ نموونە کەلوپەل بهێتە دیارکرن و ژبەر کو پێکگهۆرین د جڤاکێن هەڤچەرخدا برێکا دراڤی دهێتە کرن پشتی دەستبەردانا ژ شێوازێن پێکگوهۆرین (المقایضة Barter) لەورا دشێین نرخێ کەلوپەلان ب دراڤی بدانین و نرخێ زێری ب دراڤی دەستنیشا بکەین، بڤی شێوەی نرخ پێکهاتییە ژ دەربرینا نەختینەیی (کاش) (التعبیر النقدي) بۆ بهایێ شمەکەکێ ئابووری.

دەمێ دبێژیت ئاڤێ بهایێ خۆ هەیە مەرەم ژوێ پێدڤییەکا دیارکرییا مرۆڤی پردکەت بکارئینانا ئەڤی شمەکی دهێتە دەست لسەر ڤی بنەمای هزرکرن ژ مفای ئەوە کو بهایێ بکارئینانا ئەڤی شمەکی ڤە دگریت بێی بەرچاڤ وەرگرتنا بلندی و نزمییا نرخێ وی دبازاریدا بەلێ بەحسکرنا بهایێ خانیەکێ دیارکری، ئاماژە بڤی بهای مەرج نینە ب نرخێ فرۆشتنا ئەڤی شمەکی بهێتە دانان یان بهایێ پێکگهۆرینێ بیت، ب رامانەکا دی ئەڤ نرخێ کو کرێکارەکی دڤێت بدەت بەرامبەر بدەستڤەئینانا وی خای یان ئەڤ نرخێ کو پێدڤییە بدەت ئەگەر حەزا بدەستڤەئینانێ هەبیت ئەگەرێ بڤێت تێدا ئاکنجی بیت.

## پێشڤە چوونا بیردۆزا بهای:

## The progress of Value Theory

شرۆڤەکرنا کێشا بهای د چەند قوناغان را دەربازبوویە هەتا کو گەهشتیە ئەوا نهۆ هەی، دشێین لگۆر ئەو بیردۆزێن (تیور) لخارێ ڤەکۆلینێ دەربارەی پێشڤەچوونا شرۆڤەکرنا بهای بکەین:

### ئێك: بیردۆزا بهایێ کاری و مەزاختیا بەرهەمی:

نڤیسەرێن کلاسیك جوداهی دناڤبەرا بهایێ بکارئینانێ و بهایێ پێکگوهۆرینێدا کریە. بهایێ بکارئینانێ ئەو مفایە کو کەسەك ژ بکارئینانا شمەکەکی بدەست کەڤیت. بەلێ بهایێ پێکگوهۆرینێ ئەو رێژەیە یا کو ژ ئەنجامێ پێکگوهۆرینا شمەکەکی ب شیمەکەکێ دی د بازاریدا بدەستڤە دئینت. بهایێ پێکگهۆرینی بۆ هەر شمەکەکی ب بۆچوونا کلاسیك لسەر بنەمایێ ئەوی کاری یە یێ کو دکەت. یان لسەر بنەمایێ هژمارا دەمژمێرێن وێ کارکرنێ کو کارتێدا هاتییەکرن بۆ بەرهەمئینانا وی شمەکی.

رەخنە ئارستەکرییێن (رەخنەگرێن) بیردۆزا کاری بۆ بهای:

### ئەو رەخنێن کو ئاراستەی بیردۆزا کارێ بهای هاتینە کرن:

١-ژ پشتگۆه هاڤێتنا کاریگەرییا خواستێ لسەر بهایێ شمەکان. چونکی برەکێ زۆر ژ کاری بۆ بەرهەمئینانا شمەکەکێ دیارکری دهێتە مەزاختن، بەلێ دەمێ ئەڤی شمەکی دئێخنە دبازاریدا خواست لسەر نابیت، د دویڤدا ژی بهایێ ئالۆگوریێ نابیت.

٢-بنەماییێن دی کو پشکدارییێ دوێ بەرهەمئینانێدا دکەن لبەر چاڤ وەرناگریت، هەر چەندە ریکاردوی دانپێدان بگرنگییا سەرمایەی دکریار بەرهەمئینانێدا کریە بەلێ بشێوەکێ نەراستەوخۆ، چونکی ب پاشە کەوتکری ل قەلەم ددەت. بەلێ ئەو بۆچوونا کو سەرمایە هەردەم دگەل کاریدا ب رێژەکا جهگر پشکدارییێ دکەت د کریارا بەرهەمئینانێدا بۆچوونەکە یا ژ راستییێ دوویرە.

٣- ئەڤ بیردۆزە نەشێت دیاردا بهایی لێکبدەتە ڤە. و بهایێ فرۆشتنا هەر تشتەکی د بازاریدا بتنێ ب برێ تێچوونا وێ دبەرهەمئینانێ دیار ناکەت. چونکی ئەڤ بیردۆزە بارودۆخێ خواستێ لسەر وی شمەکی دبازاریدا ژ پشتگوە ئێخستیە.

٤- هەروەسا نەشێت بهایێ شمەکێن کێم هەیی لێکبدەت ئانکو ئەڤان شمەگان نەشێن جارەکا دی بەرهەم بینە ڤە بۆ نموونە (تابلۆییێن (کەڤالێن) هونەری).

## دوو: بیردۆزا مفایێ سنوورەکی: Marginal Utility Theory

لدەمێ کەسەك هزر دنرخێ شمەکەکیدا دکەت کو لبەر بیت بکڕیت ئێکسەر هزر دمفای ژیدا دکەت کو ژوی شمەکی بدەست کەڤیت. کێم هزر د بهایێ وی شمەکی و تێچوونا بەرهەمئینانا ویدا دکەت. دشێن بێژین بکڕ هەردەم هەولددەت بهایێ وی شمەکی و مفایێ وێ پێکڤە گرێدەت، لڤێرە پێدڤییە ئەڤێ پرسیارێ بکەین کە ژبەر چ ئابووریناسێن گلاسیك (کەڤن) بهایێ شمەکان ب مفایێ وانڤە نا گرێدەن.

ئابووریناسێن کلاسیك وەکو: ئادەم سمێت، و دیڤید ریکاردۆ، و ئەوێن دیتر ئەڤ پێکڤە نەگرێدانا دناڤبەرا بهایێ پێکگوهۆرینا تشتان و مفایێ وان بۆ دوو هۆکاران ڤە دگەرینن:

١- هۆکارێ سەرەکیێ ئێکێ ئەوە کو کلاسیك بەرەڤ هندێ دچن کو ژ دیرۆکا بیردۆزا بهایان ب (نهێنییا بهای) یا بەرنیاسە ئەوان تێبینیا هندێ کر کو هندەك شمەك هەنە مفایەکی گەلەکێ مەزن ددەن وەك (هەوا) کو چ بهایەکی بازاڕی نینە، هەوا دشێوێ سروشتیێ خودا شمەکەکێ سەربخۆیە و هەمی گیاندار دشێن پێدڤیێن خۆ ژێ دابین بکەن بێی هیچ بەرامبەرەکی، دهەماندەمدا تێبینی یا هندێ کرن کو هندەك شمەك هەنە مفایێ وان گەلەك کێمترە ژ مفایێ هەوای کو چ دسەر ڤێرا ژی نرخێ وان گەلەکێ بلندە. ئەڤ هزرکرنا سادە ئاماژە ب نەبوونا پەیوەندییێ دناڤبەرا بهایێ هەوای و مفایێ ویدا دکەت.

بەلكو وەدكەت وەسا بهێتە زانین كو بهایێ هەوای (بای) وەكهەڤە ب چنە، چونكی تاكە كەس چ تشتەكی نادەت بۆ بدەستڤەئینانێ.

٢- هۆكارێ دووێ خۆ دمەزاختنێن بەرهەمیدا دبینیت بۆ گەریان بدویف لێكدانە ڤەیا بهایێ پێكگوهۆرینێ بۆ شمەكان و مژویلبوونا وان ب بابەتێ شرۆڤەكرنا ئەوان هۆكارێن كو پشكا رێژەیی یا ڤان بنەمایان دیاردكەت كو دوێ بەرهەمئینانێدا پشكداری كرینە.

هەتا داوییێن سەدێ نۆزدێ بیردۆزا مەزاختیا بەرهەمئینانێ بۆ بهای بەردەوام هزرا ئابووری ب خۆڤە مژویلكربوو دەمێ بیردۆزا مفایێ سنوورەكی لسەر دەستێ رێبەرێن قوتابخانا شرۆڤەكرنا سنووركی (مدرسة التحليل الحدي) وەك: (كارل مێنجر، و ستانلی جیڤۆنز، ولیۆن ڤالراس) سەرهلدای. و ل وی دەمی ئەڤ ڤەدیتنێن زانستی د پێشڤەچوونا بیردۆزا بهای دا دەركەفتن.

جهێ ئاماژە پێكرنێ یە كو بنەمایێن سەرەكیێن بیردۆزا جیڤونزی و قوتابخانا كلاسیكی د پەرتووكا جۆش دا بەحسی ژێ هاتییە كرن بنەمایێ سەرەكیێ وێ پیردۆزێ بۆ بهای دڤی برگەیدا هاتییە كورتكرن (بها بتمامی پشت ب مفای ڤەگرێددەت) بهەمان رێبازا (جۆشن)، (جیفونزی) ئەو كاریگەری شرۆڤەكرییە كو گوهۆرینا برێ شمەكان بسەر مفایێن وەرگرتی دا دهێت ژ مفایێ یەكێن بدویڤ ئێكدا. ب بنەمایێ كێمبوونا مفایێن وی دانایە، و دبەحسكرنا خودا بۆ پێكهاتنا بهایێ پێكگهۆرینێ دگەل یاسایا دووێ یا جۆشنی ریككەفتی یە گەهشتە ئەنجامەكی كو حالەتێ (دۆخێ) هەڤسەنگیا د پێكگوهۆرینا دو شمەكان دا، دەمێ هەڤسەنگ دبیت

کو مفایێن وێ یێن سنوردار دناڤبەرا دووشمەکاندا نرخێ وان وەکی ئێك بن.
ب رامانەکا دی هزرڤانێن ڤوتابخانا سنووورداری بۆچوونێن وان وەسانە کو بهایێ هەر شمەکەکی دەربارەی کەسەکی ب وی مفایی دهێتە دیارکرن کو ژ دووماهی یەکا بکاربەر وەردگریت بڤی شێوێ خارێ رەخنە لێ هاتییە گرتن.
یەکێن ئێکی ژ شمەکی مفایەکێ زۆر ددەت ب هەڤبەرکرن دگەل فایدێ دووماهی یەکە، و چاوا بهایێ هەمی یەکان لسەر بنەمایێ مفایێ دوماهی یەکە دیاردکەت؟
ژبۆ بەرسڤدانا ئەڤێ پرسیارێ ئاماژە ب تاگرێن ڤوتابخانا سنووورداری دهێتە کرن ب یاسایەکا دیتر وەردگرن کو ئەو ژی (یاسایا جهگرتنێ) یە ل گۆر ڤێ یاسایێ یەکێن هەڤشێوە و جهگر دشمەکیدا کو هەمان سالوخەت هەنە کو دشیێن هندەك جهێ هندەکان بگرن هەمیان هەمان بها هەیە بڤی جۆری یەکێن وەکهەڤ دهەمان شمەکدا هەمی لدەڤ کەسەکی بن هەمان بها دێ هەبیت.
چونکی هەر شمەکەك ژ وان جهێ یەکێن دی دگریت و ژبەر کو دووماهی یەکە هەلویستێ وی کەسی دیاردکەت بۆ گشت یەکێن شمەکی، لەورا هەر یەکەیەك ژ یەکێن شمەکی هەمان بها هەیە کو لسەر بنەمایێ مفایێ یەکا دووماهیێ دهێتە دیارکرن.

ئەو رەخنا لڤێ بیردۆزێ (بیردۆزا مفایێ سنووردار هاتیە گرتن ئەوە کولایێ خستە رووی د شرۆڤەکرنێ دا بها پشت گوە ئێخستیە بەروڤاژیا بیردۆزا کاری بۆ بهای.

بەلێ (ئەلفرید مارشال) ب گونجاندنا ناڤبەرا مفایێ سنووردار و خەرجیێ سنووردار د شرۆڤەکرنا وی بۆ بهای دا وەرگرتیە یا ئێکێ کونترۆلا خواستێ (داخوازی) دکەت یا دووێ کونترولا خستە ڕووی دکەت. بەلێ (هێکس) ڕەخنا وی ژ پیڤانا مفایێ سنووردار یێ وی ئەوە کو دشیاندا نینە ل شوینا وێ هزرا تێکرایێ شوین گرتنا سنووورداری بهێنە ب کارئینان

## تێگەهێ نرخی Im porance of price

دەزگەهێن بەرهەم ئینانێ و کارگێری ب تایبەتی دەزگەهێن بەرهەم ئینانێ بڤی شێوەی پێناسا نرخی دکەن.

-دیارکرنا بهایێ شمەکی یان خزمەتگوزاریێ ب پارەی.

-یان پێکهاتیە ژ برێ وی دراڤی کو بکرەکێ دیارکری دەدەتە فرۆشیارەکی ب مەرەما ب دەستڤەئینانا برەکێ دیارکری ژ شمەکی یان خزمەتگوزاریەکێ.

نرخ بۆ دو جۆران دهێتە دابەشکرن

نرخێن بێ سنوور (ڕەها): پێکهاتینە ژ نرخێ شمەکەکی و پیڤانا وی ب دراڤی.

نرخێن ڕێژەیی: پێکهاتینە ژ بهایێ شمەکەکی ب پیڤانا وی ب شمەکەکێ دی.

## گرنگیا نرخی: Im portance of price

گرنگیا وی دویَ چەندیَ دا سەرهلدەت کو ئامرازەکیَ کاریگەرە بۆ:

١- دابەشکرنا دەرامەتێن ئابووری دناڤبەرا کەرتێن جودا جودا دا ب رێکا دابەشکرنا ب کارئینەرێن کریارا بەرهەم ئینانێ.

٢- دابەشکرنا (بەلاڤ) شمەك و خزمەتگوزاریان ب سەر تەخ و چینێن جڤاکی.

٣- بلندکرنا شیانێن رێڤەبەریا دەزگەهان و هاندانا وان بۆ پێشئێخستنا لایێ (هونەری یان تەکنە لوژی).

٤- کاریگەری ل سەر شێواز و ئاراستێ بازرگانیا نیڤ دەولەتی و دابەشکرنا دەرامەتان دناڤبەرا ولاتاندا هەیە.

## دیارکرنا نرخی ژ لایێ کومپانیاڤە:

ل سەر ئاستێ کومپانیان یان یەکێن ئابوری دا، کریارا دانانا نرخی ئەرکەکێ گرانە کو رووی ب رێڤەبرنا کومپانیان دبیت، چونکی یا گرێدایە ب چارە نڤیس و شیانا مانا وێ د بازاری دا، هەتا کو بشێن شمەك و خزمەتگوزاریان ب باشترین نرخ و ب کێمترین ئەرك و تێچوونێ پێشکێشی بکاربەران بکەت و پا بەندبوونا خۆ بەرچاڤ بکەت بەرامبەری وی جڤاکی کو بنیاتێ هەبوونا وان کومپانیایە.

هەر چەندە کومپانی ل دویڤ ب دەستڤەئینانا مەزنترین داهاتی دگەل بلندترین رێژا مفای دا دگەڕیت لەورا ژ دل مرادی نرخان کێم دکەت بۆ گرنگیا (پشتراستکرنا) (ضمان) پشکا خۆ د بازاری دا و روو ب رووی بوونا پێشبرکیا (بەریکانا) کومپانیاێن دی تر.

میکا نزما دیارکرنا نرخان ژ سیستەمکێ ئابوری بۆ سیستەمەکێ دی جودایە و هەروەسا یا جودایە د ناڤبەرا بازارێن ئێك سیستەم ژی دا، ئەو هۆکارێن کو نرخێ بەرهەمێ چاندنێ ل بازاری دیاردکەن جودانە دگەل ڤان هۆکارێن کو نرخێ شمەکێن پیشەسازی و خزمەتگوزاری دیاردکەن.

د سیستەمێ سەرمایەداری دا نرخ ل دویڤ میکا نزما بازاری ((هێزێن خستە رووی و خواستی (داخوازی) دهێتە دیارکرن مولکداریا تایبەت (الملكية الخاصة) پێدڤی ب هەبوونا شیوازێ بکاربرنێ و مافێ بکاربرنا ڤان شێوازان هەیە و بکاربەر یێ ئازادە ل چاوانیا ب کارئینانا داهاتێ خۆ و ئەو شێوازێ کو دگەل وی دگونجیت گریمانێن دی کو ل بن سیبەرا وان میکانزما نرخان کاردکەن بۆ کونترۆل کرنا وێ میکانزمێ کو ل دویڤ یاسایا خواست و خستە رووی (داخوازی بەرچاڤکرنا) نرخان بریاردانە ب رادەکێ مەزن ب رێکا پەیوەندیان ل ناڤبەرا بەرهەئینی و ب کاربەری (بەرهەمێنەری و بکارئینەری) ئانکو گونجاندن ل ناڤبەرا حەزا بەرهەم ئینەران و ب کاربەران لەورا نرخ پیڤەرەکێ گرنگە و رێنیشاندەرە بۆ بەرهەم ئینەران بۆ ب دەستڤە ئینانا پترترین قازانجی، بەلێ ئەڤە وێ ناگەهینیت کو نرخ بکەڤنە بن کاریگەریا میکانزما بازاری و هێزێن خواست و خستە ڕووی بێ رێکخستن و دیارکرن بمینن.

## ئەو هۆكارێن كار دكەنە سەر نرخان:

دشێین گرنگترین وان هۆكاران دەست نیشان بكەین كو ب شێوەكێ راستەوخۆ و ناڕاستە و خۆ كاردكەنە سەر دیاركرنا نرخان بڤی شێوێ ل خوارێ:

**١- تێچوون:** ب ئێك ژ هۆكارێن گرنگ دهێتە دانان بۆ دیاركرنا ئاستێ نرخان كو ل دەمێ دەست نیشان كرنا نرخان پێدڤیە بهێتە بەرچاڤ كرن.

تیچوون هەمی وان خەرجیان ڤەدگریت كو پێدڤینە بۆ بنەمایێن بەرهەم ئینانێ ل كاری و پێدڤیا شمەك و خزمەتگوزاریێ زێدەباری ڤان خەرجیان كو شمەك پشتی بەرهەم ئینانێ و پیدڤی پێ هەی هەتا كو گەهاندنا وی بۆ دەستێ بكار بەری هەر زێدەهیەك د خەرجیێن تێچوونێ دا دێ بیتە ئەگەرێ زێدەبوون دنرخاندا د بەروڤاژیا وێ ژی ڕاستە. نرخان پێدڤیە كێمترین ڕادە ل تێكرایێ تێچوونێن گوهۆری بدەت بۆ هندێ دەزگەه دكارێن خۆ دا بەردەوامبن.

**٢- هۆكارێن رامیاری ( سیاسی ) Political Factors**

بێ رابوونێن پەیرەوكری ژ لایێ دەولەتێ ڤە كو یا گرێدایە ب ئارمانجێن رامیاری و ئابووری و كومەلایەتی بۆ هەر رژێمەكا ڕامیاری ب هۆكارێن كاریگەر دهێنە هژمارتن بۆ دیاركرنا نرخان. بۆ نموونە پێ ڕابوونێن دیاركرن و چەسپاندنا نرخان بۆ هندەك ژ شمەك و خزمەت گوزاریان دەرئەنجام دێ بیتە ئەگەرێ بلندبوونا شیانا كڕینێ ل دەڤ كەسان و یان دابینكرنا داهاتێ بەرهەم ئینەران

دابينكرنا داهاتێ بەرهەم ئينەران ب رێكا دەستەبەركرنا كێمترين ڕادێ نرخی بۆ بەرهەمێن وان دابينكرنا شمەكێ بەرهەم ئينەران و كەرستێن خاڤ ب نرخەكێ كێم، هەمی هۆكارێن گرنگ پێ ڕابوونێن رامیارینە كو دەولەت ب كاردئینت ئارمانجا وێ ئەوە كارتێكرنێ ل سەر نرخان بكەت.

## ٣- پلا هەڤڕكيكرنێ (المنافسة) Competitlon

ئەو هەڤڕكی كرنا كو د بازاریدا هەی ب گرنگترین هۆكار دهێتە هژمارتن بۆ دياركرنا نرخێن شمەك و خزمەت گوزاریان چونكی هۆكارێ هەڤڕكیێ د دانانا نرخی دا ل وان سێستەمێن كو پلانا ناڤەندی (مركزي) پەیرەو دكەن ل رێڤەبەرنا ئابوریێن خۆ كێمترە چونكی نرخان لدویڤ رێنما و پێ رابوونەكێ كو دەولەت ل ناڤەندی ڤە دەردئێخیت و دیار دكەت. و هەروەسا هۆكارێ هەڤركیێ ل بەرامبەر شمەكێن (هاتینە قورخكرن) كاریگەریا خۆ نابیت. چونكی نرخ ژ لایێ كومپانیێن بەرهەم ئینەر و قۆرخ كری ڤە دیاركەت.

## ٤- رامياريا دارايی (خەرجی) Fiscal and polic Expenaiture

زێدەكرنا رامياريا خەرجيێن دەولەتێ ژ هەردوو لایێن ڕەوان (الجاري) و وەبەرهێنانێ دا. كار ڤدانەكا مەزن یا هەی ل سەر ئاستێ نرخان چونكی زێدەكرنا خەرجیێن گشتی، راستەو خۆ دبیتە ئەگەرێ زێدەبوونا خواستی ل سەر شمەك و خزتگوزاریان وبشێوەكێ نا راستە خۆ داهاتێ كەسان زێدە دبیت ((دوو جاران هند زێدە دبیت)).

(اثر المضاعف Multiplier effect) ئەگەر ئەڤ زێدە خواستنە زێدەییەك بەرامبەر نەبیت د بەرهەمئینانێ دا، د ئەنجام دا دێ بیتە ئەگەرێ زێدەبوونا خواستنێ ب بەراورد دگەل خستە رووی دا و نرخ دێ بلند بنەڤە. و بەروڤاژی یا وێ ژی ڕاستە، کونترۆلکرنا ئاستێ نرخان دڤی حالەتی دا بابەتەکێ گرنگە پێدڤی ب پێ ڕابوونا هەیە بۆ چارەسەرکرنا حالەتێن خەندقاندنێ ئەو ژی رێکخستنا گوهۆرینا نرخان بهێتە کرن.

## ٥- رامیاریا بازرگانیا دەرڤە یا دەولەتێ Foreign Trad Policy

ئەو ڕامیاریا دەولەت پەیرەودکەت دبیاڤێ ((هاوردەی و هناردنێ)) دا یا کاریگەرە ل سەر نرخان. چونکی بازرگانیا دەرڤە ڕۆلەکێ گرنگ دبینیت ل داکوکی کرنێ ل سەر نرخان ب رێکا کاریگەریا خواستیا دەرڤە ل سەر شمەکێن نافخۆ و ئەو شمەکێن کو ل دەولەتێ ئێخستینە ڕووی. ب ئاشکرا دیاردکەڤیت ئەڤ خواستە دبلندبوون و نزم بوونێ دانە ب رێکا زێدەکرنا هنارتیان یان بکاربەران یان دابەزینا وان. هەروەسا (هاوردە) (الاستیراد) ئێکە ژ هۆکارێن بلندبوونا نرخێ شمەك و خزمەتگوزاریان ل دویڤ هندێ کو ڕێکەکە بۆ ڤەگوهاستنا هەلاوسانا جیهانی (التضخم العالمي) لەوراکاری دکەتە سەر ئاستێ نرخێن نافخۆ ب تایبەتی ل وان ولاتێن کو ئابووریێ وان پشتێ ب جیهانا دەرڤە گرێ ددەت وەکی د پرانیا ولاتێن تازە پێگەهشتیدا.

## ٦- ڕمياريا نەختينەى ( دراڤ ) Monetary Policy

ڕاميارريا نەختينەى (ب راميارريا باوەركرنێ ڤەژى) ب نرخان گرێدايە ب رێكا كاريگەريا رێژا دراڤى دپێك گوهۆرينێ دا (خستە روويا دراڤى) دهێتە كرن، دشياندايە بهێتە ب كارئينان بۆ هاندانا كەسان بۆ باشەكەوت كرن (عمباركرن) و وەبەرهێانێ و يان كێم كرنا بساناهيكرنا بانكى ب شێوێن جودا جودا ئەڤە ژى دبيتە ئەگەرێ كێم بوونا قەبارێ دراڤى دپێك گوهۆرينێ دا.

## ٧- هۆكارێن جڤاكى : Social Factors

هۆكارێن جڤاكى كاردكەنە سەر نرخ و ئاراستێن وى ئەڤەژى ب رێكا پێكڤە گرێدانا خواستى ل سەر شمەك و خزمەت گوزاريان دكاريگەريا وى ل سەر وان شێوازێن ب كاربرنێ كو هەنە ژ هەميا گرنگتر ئەڤێن خوارێنە:

أ-قەبارە و پێكهاتێ ئاكنجييان ل دويڤ ژيى و ڕەگەزى

ب-هاتن و چوونا ئاكنجييان دناڤخۆ و دەرڤەدا.

ج-ئەو شێوازێن ب بكاربرنێ كو گرێدداينە ب ڕەوشت و نيتالێن جڤاكى ڤە.

## پسیارێن پشکا دووێ

پ١/ پێناسا ڤان زاراڤان بکە:

بهایێ بکارئینانێ - بهایێ پێك گوهۆرینێ - مفایێ سنووردار - مفایێ سەرجەم.

پ٢/ بەرسڤا ڤان پرسیارێن خوارێ بدە:

١-ل دویڤ بیرۆباوەرێن کلاسیکی چاوا بهایێ پێك گوهۆرینێ دهێتە دیارکرن؟

٢-بەحسێ بۆچوونێن کارل مارکسی بکە سەبارەت بهای؟

٣-بەحسێ وان ڕەخنا بکە کو هاتینە ئاراستەکرن بۆ بیردۆزا کارکرن بۆ بهای؟

٤-ڕێسایا کێمبوونا مفایی شرۆڤەبکە.

٥-بها ژ لایێ جیفونزی ڤە چاوا هاتیە شرۆڤەکرن؟

٦-چاوا دشێین بهایێ هەمی یەکێن شمەکی ل سەر بنەمایێ مفایی دوماهی یەکە دیاربکەن.

٧-چاوا نرخ دهێتە دیارکرن د سێستەمێ ئابووریێ سەرمایەداری دا؟

٨-کۆمەکا هۆکاران کاری دکەنە سەر نرخی. ئەو هۆکار چنە؟

٩-ژبەر چێ بۆ چوونێن ریکاردوی ل دۆر بهایی ب (بیردۆزەکا بۆ تێچووێن بەرهەم ئینانێ دهێتە دانان)؟

١٠-بۆچی ئابووری ناسێن کلاسیکی بهایی تشتەکی ب وی مفای کو ژ وی تشتێ دهێتە وەرگرتن ڤە گرێدایە؟

پ٣/ئەڤ رستێن ل خوارێ ڕاستن ($\surd$) یان خەلەتن ($\times$) دیاربکە:

١- پەیوەندیا دناڤبەرا تشتەکی و مفایێ وی: ڕاستەوخۆ ل ناڤبەرا بهایێ وی و سەرجەمێ مفایێ وی دانیینە بەلکو لناڤبەرا بهایێ وی و مفایی سنووردارێ وی هەیە.

٢-بیردۆزا مفایێ سنووردار لایێ خستنە رووی ژ شرۆڤەکرنا وی دا بها بشت گوە ئێخستیە

٣- کاریگەریا هۆکارێ هەڤرکیێ ل سەر نرخی د وان سێستەمێن کو پلانا ناڤەندی پەیرەودکەن د رێڤەبەرنا ئابوورییێن خۆدا.

٤- خەرجیا بەرهەم ئینانێ ل دویف گوهۆرینا قەبارێ بەرهەمی دگوهۆریتن ب ڤێ ژی ئێك خەرجیا بەرهەم ئینانێ نینە بۆ هەر شمەکەکی بێی بەرچاڤ وەرگرتنا بڕێ بەرهەم ئینا وی.

٥- بهایێ هەر شمەکەکی بۆ کەسی ل دویڤ ئەوی مفایە کو ل دووماهی یەکا ب کارهاتی وەرگرتی دهێتە دیارکرن.

## ژێدەرێن پشکا دووێ


١-توني همفريز، المال و القيمة يجددان حياتك، تعريب احمد العمري، مكتبة العبيكان، الرياض، ٢٠٠٢.

٢-د. حسين عمر، مقدمة في علم الاقتصاد: نظرية القيمة، الطبعة السادسة، دار الشروق، جدة، ١٩٨٢.

٣--د. رضا صاحب ابو حمد و د. مؤيد عبدالحسين الفضل، اساسيات اقتصاديات الاعمال، الطبعة الاولى، دار المناهج للنشر و توزيع، عمان، ٢٠٠٣.

٤-د. صبحي تادرس قريصة و د. اسماعيل محمد هشام و د. محمد عبدالعزيز عجمية، مقدمة في الاقتصاد، دار الجامعات المصرية، الاسكندرية، ١٩٧٦.

٥-د. محمد صالح القريشي و د. ناظم محمد نوري الشمري، مبادئ علم الاقتصاد، جامعة الموصل، دار الكتب للطباعة و النشر، الموصل، ١٩٩٣.

٦- عبدالقادر محمد عبدالقادر عطية، التحليل الاقتصادي الجزئي بين النظرية و التطبيق، الدار الجامعية، الاسكندرية، ٢٠٠٥.

٧-د. محمد علي الليثي و د. عبدالرحمن يسري احمد، مقدمة في علم الاقتصاد: الاقتصاد الجزئي، الجزء الاول، الدار الجامعية، الاسكندرية، ١٩٨٧.

٨-د. علي يوسف خليفة و د. احمد زبير جعاطة، النظرية الاقتصادية، التحليل الاقتصادي الجزئيظن دون ناشر، دون مكان، دون تاريخ.

٩- د. كامل البكري، الاقتصاد التجميعي، مؤسسة شباب الجامعة للطباعة و النشر، الاسكندرية، ١٩٨٥.

١٠- يوسف كامل محمد، فقه الاقتصادي السوق، النشاط الخاص، الطبعة الثالثة، دار النشر للجامعات، القاهرة، ١٩٩٨.

١١-سوزان لي، ابجدية علم الاقتصاد، ترجمة: خضر نصار، مركز الكتب الاردني عمان ١٩٨٨.

12- Micheal A. Leeds, Peter Von Allen & Richard C. Schiming," Econo – mics", Pearson Education Inc, Boston, 2006.

13- Jeffrey M. Perloff," Microeconomics", Fourth Edition, Pearson Int,l Edition, Boston, 2007.

14- Robert J. Gordon, "Macroeconomics", 10th Edition, Pearson Inc, New York, 2006.

15- Stanly L. Brue & Campbell, "Essentials Of Economics", McGraw – Hill Inc, Boston, 2007.

16- Damodar N. Gujarati, "Essentials of Economics", Third Edition, McGraw – Hill Inc, Boston, 2006.

17- Stephen L. Slavin, "Economics", 8th Edition, McGraw – Hill, New York, 2008.

18- Bradley R. Schiller, "The Microeconomic Today", 10th Edition, McGraw – hill, Boston, 2006.

19- Bradly R. Schiller, "The Macroeconomics Today", 10th Edition, McGraw – Hill, Boston, 2006.

20- Dvid D. Friedman, "Price Theory", 2nd Edition, South – Western Publishing Co, 1990.

# پشکا سیێ

# بازار

# The Market

## پێناسا بازاری

بازار: چوار چۆڤەیەکە کومەکا بکڕ و فرۆشیاران بخۆڤە دگریت و ئەوان پەیوەندیا موکم یا هەی و پێکگوهۆرینێ دناڤبەرا ئێك و دوو دا دکەن بێ ی چ ئاستەنگ.

دڤی پێناسێ دا بۆ مە دەردکەڤیت کو بازار چوار ڕەگەزان بخۆڤە دگریت:

١-هەبوونا شمەکەکی بۆ پێکگوهۆرینێ.

٢-هەبوونا بکڕی

٣-هەبوونا فرۆشیاری.

٤-ئازادیا پێکگوهۆرینێ بێ ئاستەنگ.

ئەو هۆکارێن چوارچۆڤی بازاری دیاردکەن ئەڤەنە:

١-سروشتیا شمەکی.

٢-ڕەوشت و تیتال.

٣-ساناهیا گەهاندنێ.

٤-ئاستەنگێن گومرکی د چەندایەتی.

## بنەمایێن گرنگێن بازاری:

بەری ئەم شێوێن بازاری شرۆڤە بکەین پێدڤی یە ئاماژێ ب ڤان بنەمایێن گرنگ بکەین کو کاردکەنە سەر شێوێ بازاری:

١-بکێرهاتنا بەرهەمان و پلا گونجانا وان (بکێر هاتنا وان).

٢-هژمارا فرۆشیاران لایێ کێم و زێدەهیێ ڤە.

٣-هژمارا بکڕان ژ لایێ کێم و زێدەهیێ ڤە.

٤-ڕادێ ئەوێ هاریکاریێ کو ل ناڤبەرا بکڕی دفرۆشیاری هەیە، ئانکو هەتا چەند پەیوەندیێن تایبەت کاردکەنە سەر وی نرخی کو ل بازاری هەیە.

## شێوێن بازاران The Tupes of Marktcts

بازاران دوو شێوێن سەرەکی یین هەین:

### ئێك: بازارێ هەڤرکیێ تەمام Free Com Petition Market

سالۆخەتێن ڤی بازاری ئەڤەمە:

١-هەبوونا هژمارەکا زۆر ژ بەرهەم ئینەران و بکڕان.

٢-گونجاندنا بەرهەمی و شمەکان.

٣-کێمیا قەبارێ خستە رووی بۆ هەر بەرهەمەکی و کێمیا قەبارێ خواستی.

بۆ هەر بکاربەرەکی ب بەراور دگەل خستە رووی و خواستێ بازاری.

٤-چ جۆرەکی ئاستەنگان ل سەر نرخی نەهاتیە دانان.

٥-ئازادیی د دهاتنا ناڤ و چوونا دەرڤەی د بازاری دا.

٦-زانياريا تەمام ل سەر بارودۆخ و چاواتيا بازارى هەيە ب تايبەتى دەربارەى نرخێن كڕين و فرۆشتنێ.

٧-نەبوونا تێچوونێن ڤەگوهاستنێ. چونكى هەبوونا ئەڤێ تێچوونێ راماناهەڤسەنگيێ نينە ل نرخان بەلكى دوو جۆرێن نرخان هەنە نە وەكى ئێك نرخە، و ئەگەر ئەڤ تێچوونە ژى هەبيت ئەوا پێدڤى ژ لايێ كێم هەڤ شێوە بيت ل ناڤبەرا فرۆشياران ژ لايەكى و بكڕان ژ لايەكى دى ڤە. ئانكو نەمانا ئەوێ جوداهيێ كو د ئەنجامێ تێچوونا ڤەگوهاستنێ دا دهێتە گۆرێ.

**تێبينى :** ئەگەر بتنێ هەر پێنج مەرجێن ئێكێ هەبوون دێ بێژينە ڤى بازارى بازارێ هەڤركيێ پۆخت، بەلێ دەمێ هەر ئەو حەفت مەرج هەبوون دێ بێژينە ڤى بازارى بازارێ هەڤركيا تەمام.

## دوو- بازارێ هەڤڕكيێ نا تەمام

ئەڤ بازارە بۆ ڤان جۆرێن ل خوارێ دهێتە دابەش كرن

### ١- بازارێ قورخكريێ ڕەها ( بێ سنوور)

مەرجێن قورخكاريا ڕەها (بێ سنوور) دفرۆشتنێ دا

أ-ئێك بەرهەم هێن هەبيت.

ب- ئەڤ بەرهەم ئينەرە كونترۆلێ لسەر خستنە روويێ شمەكان دكەت و چەميايێ خستنە روويا قورخ كار پێكهاتيە ژ خالەكێ يان چەمايەيەكى كو نەرميێ ديار ناكەت.

## مەرجێن ڤۆرخكاریا بێ سنوور دكرینێدا :

١-ئێك بكرِ هەبیت.

٢-دەست ب سەر خواستی دا دگریت.

٣-چەمیایێ خواستێ خالەكەیان نەرمی نواندن نینە.

## ٢- بازارێ ڤۆرخكریێ كێم :

## مەرجێن ڤۆرخكاریا كێم د فرۆشتنێدا :

أ-هژمارا فرۆشیاران یان بەرهەمئێنەران یا كێمە.

ب-هەبوونا پەیوەندییێن پێكگوهۆرینێ ئانكو هەر بەرهەم ئینەك بەر چاڤی كارڤەدانا بەرهەم ئینێن وی دكەت.

١-بۆ هەبوونا دوو بەرهەم ئینا دبێژنێ بازارێ ڤۆرخكریێ دوو لایەنی.

٢-نرخ دڤی بازاریدا دجودا جودانە بەلێ بەرهەم وەكی ئێك دچن یان ب تەمامی وەكی ئێك ناچن و ئەگەر شمەك وەكی ئێك بچن دبێژنێ ئەڤ ڤۆرخكرنە كێم ڤۆرخكرێ نەتمامە یان جۆرا و جۆرە.

## مەرجێن ڤۆرخكاریا كێم دكرینیدا :

## هژمارا بكرِان یا كێمە :

هەر ئێك ژ وان كاریگەریا خۆ ل سەر نرخی هەیە.

٣-بازارێ پێشبركیێ ڤورخكرنێ:

## مەرجێن ڤۆرخكرنێ د فرۆشتنێدا

١-هەبوونا هژمارەكا زۆر ژ فرۆشیاران یان بەرهەمئێنەران.

٢-هەر بەرهەمئێنەك یان فرۆشیارەك دشێت خۆ ژیێن دیتر جودا بكەت.

٣-جوداهی هەیە دنرخی دا ((هەر بەرهەمئینەك دشێت خۆ جودابكەت د رێیا رێكلام، جهـ، شێوزێ فرۆشتنێ دا... هتد)).

## مەرجێن پیێشبیركیا ڤۆرخكرنێ د كرینێدا :

١-هەبوونا هژمارەكا زۆر ژ بكڕان.

٢- هندەك ژ بكڕان (بۆ نموونە دابەشكران) دشێن خۆ جودا بكەن دناڤبەرا فرۆشیاران، ب جۆرەكی مامەلە دگەل ئێك ژ وان یێ باشترە ژیێن دیتر.

## هەڤسەنگیا بەرهەمئینی دبازارێ پیێشبركیا تمامدا :

بەرهەم ئین هەڤسەنگك دبیت دەمێ داهاتێ سنوورەكی و تێچوونا سنوورەكی وەكهەڤ بن و دڤێت تێچوونا سنوورەكی بلند بیتە ڤە.

دڤی بازاریدا بەرهەمئین بەردەوام دبیت ل سەر بەرهەم ئینان و فرۆشتنێ هەتا ئەو دەمێ کو داهاتێ سنوورەکی وەکهەڤ بیت دگەل تێچوونا سنوورەکی چونکی ئەڤ بارە بلندترین ئاست ژ قازانجی بۆ دابین دکەت و د ڤێ نموونا خارێدا هەڤسەنگی ژ دانەیا یازدێدا دروست دبیت چونکی داهاتێ سنوورەکی و تێچوونا سنوورەکی د وەکهەڤن (٢٠)، و ئەگەر هەر دانەك دوازدێ بەرهەم بینت ئەڤجا داهاتێ سنوورەکی وێ کێمتر بیت ژ تێچوونا سنوورەکی (٢٠ < ٢٤) بڤێ چەندێ ژی قازانج دێ کێم کەت ژ (٣٠) بۆ (١٦).

| دانە | نرخ | سەرجەمێ داهاتی | تێکرایێ داهاتی | داهاتێ سنورەکی | هەمی تێچوون | تێچوونا سنووری | قازانج |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ١ | ٢٠ | ٢٠ | ٢٠ | ٢٠ | ٢٨ | ٢٨ | ٨- |
| ٢ | ٢٠ | ٤٠ | ٢٠ | ٢٠ | ٥٥ | ٢٧ | ١٤- |
| ٣ | ٢٠ | ٦٠ | ٢٠ | ٢٠ | ٧٤ | ١٩ | ١٥- |
| ٤ | ٢٠ | ٨٠ | ٢٠ | ٢٠ | ٨٩ | ١٥ | ٩- |
| ٥ | ٢٠ | ١٠٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١٠٠ | ١١ | سفر |
| ٦ | ٢٠ | ١٢٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١١٢ | ١٢ | ٨ |
| ٧ | ٢٠ | ١٤٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١٢٤ | ١٢ | ١٦ |
| ٨ | ٢٠ | ١٦٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١٣٨ | ١٤ | ٢٢ |
| ٩ | ٢٠ | ١٨٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١٥٣ | ١٥ | ٢٧ |
| ١٠ | ٢٠ | ٢٠٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١٧٠ | ١٧ | ٢٠ |
| ١١ | ٢٠ | ٢٢٠ | ٢٠ | ٢٠ | ١٩٠ | ٢٠ | ٢٠ |
| ١٢ | ٢٠ | ٢٤٠ | ٢٠ | ٢٠ | ٢١٤ | ٢٤ | ١٦ |

## هەڤسەنگیا بەرهەم ئینی دبازارێ ڤورخ كارییدا :

بەرهەم ئین دڤی بازاریدا بەردەوام دبیت ل سەر بەرهەمئینان و فرۆشتنێ هەتا وی دەمێ تێچوونا سنوورەکی و داهاتێ سنوورەکی وەکهەڤ دبیت چونکی بلندترین ئاستێ قازانجی ب دەستڤە دئینت د ڤێ نموونا ل خارێ دا باشترین ئاست بۆ بەرهەم ئینانێ دانەیا شەشێ یە تێدا داهاتێ سنوورەکی وەکهەڤ دبیت ب تێچوونا سنوورەکی (١٢ = ١٢) و بلندترین ئاستێ قازانجی ب دەستڤە دئینت کو = ٢٠ و ئەگەر بەردەوام بیت ل سەر بەرهەم ئینانێ دێ داهاتێ سنوورەکی کێم کەت و تێچوونا سنوورەکی زێدەکەت بڤێ ژی قازانج دێ دەست ب کێمبوونێ کەت هەر وەك د ڤێ نموونا خارێدا یا دیارە.

| دانه | نرخ | سەرجەمێ داهاتی | تێکرایێ داهاتی | داهاتێ سنورەکی | هەمی تێچوون | تێچوونا سنووری | قازانج |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٣٢ | ٢٢ | ٣٢ | ٣٢ | ٢٨ | ٢٨ | ٤ |
| ٢ | ٣٠ | ٦٠ | ٣٠ | ٢٨ | ٥٥ | ٢٧ | ٥ |
| ٣ | ٢٨ | ٨٤ | ٢٨ | ٢٤ | ٧٥ | ٢٠ | ٩ |
| ٤ | ٢٦ | ١٠٤ | ٢٦ | ٢٠ | ٨٩ | ١٤ | ١٥ |
| ٥ | ٢٤ | ١٢٠ | ٢٤ | ١٦ | ١٠٠ | ١١ | ٢٠ |
| ٦ | ٢٢ | ١٣٢ | ٢٢ | ١٢ | ١١٢ | ١٢ | ٢٠ |
| ٧ | ٢٠ | ١٤٠ | ٢٠ | ٨ | ١٢٤ | ١٢ | ١٦ |
| ٨ | ١٨ | ١٤٤ | ١٨ | ٤ | ١٣٨ | ١٤ | ٦ |
| ٩ | ١٦ | ١٤٤ | ١٦ | سفر | ١٥٣ | ١٥ | ٩- |
| ١٠ | ١٤ | ١٤٠ | ١٤ | ٤- | ١٧٠ | ١٧ | ٣٠- |

# پرسیارێن پشکا سیێ

پ[1]/ ئەڤان زاراڤان پێناسەبکە:

بازار - خالا داخستی

پ[2]/ بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:

١-رەگەزێن بازاری بژمێرە.

٢-ئەو فاکتەر (هۆکار) چنە کۆ چارچوڤێ بازاڕی دیاردکەن؟

٣-ئەو بنەماییێن گرنگ بژمێرە کو شێوێ بازاری پێ دهێتە دیارکرن.

٤-شێوێن بازاڕی چنە؟

٥-شێوێن بازاڕێ ڤۆرخکاریا بێ سنوور دیاربکە.

٦-چەوا بەرهەمئین دبازاڕێ پێشبرکێیا تمامدا هەڤسەنگ دبیت؟

## ژیدەرێن پشکاسییێ


١- بول أ- ساموبلسون و ويليام د. نورد هاوس، الاقتصاد الطبعة الخامسة عشرة، ترجمة: هشام عبدالله، الاهلية للنشر و التوزيع، عمان، ٢٠٠١.

٢-د. حسين عمر، مقدمة في علم الاقتصاد: نظرية القيمة، الطبعة السادسة، دار الشروق، جدة، ١٩٨٢.

٣- عبدالكريم كامل عبدالكاظم، النظم الاقتصادية المقارنة، جامعة الموصل، مديرية دار الكتب للطباعة و النشر، الموصل، ١٩٨٨.

٤- د. مصطفى رشدي شيحة، علم الاقتصاد من خلال التحليل الجزئي، الدار الجامعية، الاسكندرية، ١٩٨٦.

٥-د. كريم مهدي الحسناوي، مبادئ العلم الاقتصاد، جامعة المستنصرية، بغداد، ١٩٨٩.

٦- طاهر حيدر حردان، مبادئ الاقتصاد، الطبعة الاولى، دار المستقبل للنشر و التوزيع، عمان، ١٩٩٧.

٧- د. محسن كاظم، تاريخ الفكر الاقتصادي، إبتداء بنشاته وانتهاءَ بالماركسية، الطبعة الاولى، ذات السلاسل، الكويت، ١٩٨٩.

٨- عبدالقادر محمد عبدالقادر عطية، التحليل الاقتصادي الجزئي بين النظرية و التطبيق، الدار الجامعية، الاسكندرية، ٢٠٠٥.

٩- د. محمد علي الليثي و د. عبدالرحمن يسري احمد، مقدمة في علم الاقتصاد: الاقتصاد الجزئي، الجزء الاول، الدار الجامعية، الاسكندرية، ١٩٨٧.

١٠-د. علي يوسف خليفة و د. احمد زبير جعاطة، النظرية الاقتصادية، التحليل الاقتصادي الجزئي دون ناشر، دون مكان، دون تاريخ.

١١- د. كامل البكري، الاقتصاد التجميعي، مؤسسة شباب الجامعة للطباعة و النشر، الاسكندرية، ١٩٨٥.

١٢- يوسف كامل محمد، فقه الاقتصادي السوق، النشاط الخاص، الطبعة الثالثة، دار النشر للجامعات، القاهرة، ١٩٩٨.

١٣- سوزان لي، ابجدية علم الاقتصاد، ترجمة: خضر نصار، مركز الكتب الاردني عمان ١٩٨٨.

١٤- د. احمد حسن جاوشين، النظرية الاقتصادية: الاقتصاد الجزئي التحليلي، جامعة صلاح الدين، مطبعة الجامعة، اربيل، ٢٠٠٠.

١٥- د. رضا صاحب ابو حمد و د. مؤيد عبدالحسين الفضل، اساسيات اقتصاديات الاعمال، الطبعة الاولى، دار المناهج للنشر و توزيع، عمان، ٢٠٠٣.

١٦- د. محمد صالح القريشي و د. ناظم محمد نوري الشمري، مبادئ علم الاقتصاد، جامعة الموصل، دار الكتب للطباعة و النشر، الموصل، ١٩٩٣.

١٧- د. صبحي تادرس قريصة و د. اسماعيل محمد هشام و د. محمد عبدالعزيز عجمية، مقدمة في الاقتصاد، دار الجامعات المصرية، الاسكندرية، ١٩٧٦.

# پشکا چارێ

## دراڤ ( پـاره )

## MONEY

پێشڤه چوونا پێدڤی یێن مرۆڤایەتی و بەرفرهەبوونا حەزو ئارەزوویێن وی و گەشەکرنا وان بوویە ئەگەرێ سەرهلدانا دراڤی پشتی کو (پێکگوهۆرین: المقایضة Barter) نەشیای وان پێدڤی یان ب سڤکی و ساناهی دابین بکەت چونکی ئەڤ شێوازەیێ ب شیان و کریاری نەبوو لەورا دراڤ وەك شێوازەکێ ب شیاندار د بوارێ پێکگوهۆرینا ب کاردئینا، ژبلی ئەرکێن وی یێن دی، تاکە کەسان و گرۆپان وەك پیڤەرەك بو پێکگۆرینێ پشت پێ گرێدایە.

ب ئامرازەکێ گونجای دهێتە دانان بۆ هەلگرتنا بهای پشتی وێ کو دراڤی ب خۆ بهایێ وێ ب خۆ گرتبوو و هێزا تشت پێ کرینا خۆ بۆ ماوەکێ دیارکری پاراستبوو، و ئامرازەکە بۆ پاککرنێ (تبرئة الذمم) و پیڤەرەکێ هەڤپشکە بۆ بهایێ شمەکێن جورا و جۆر هەڤدەم ئەڤان هەول و دەرفەتان دابین بکەت بۆ هندێ حەز و ئارەزوویا بکڕان و فرۆشیاران بگونجینت و نێزیکی ئێك بکەت.

هەروەسا دراڤان شێوێن جودا جودا هەبووینە، شێوێ ئێکێ دراڤێ شمەکییە کو خۆ ژ قەبولکرنا جۆرە شمەکەکێ دیار کری دیاردکەت ژ لایێ تاکە کەسان بەرامبەر هێلان و دەست بەردانا وان ژ شمەکێن دیتردا، جۆرێ ڤی شمەکێ ب کارئینانین د جوداجودا بوون بۆ هندێ دا ببیتە پیڤەر د پێکگوهۆرینێدا ل دویڤ جوداهیا جڤاکان و ئەو قۆناغێن دیرۆکی کو ئێك ل دویڤ ئێك دا جڤاکێ مرۆڤایەتی تێدا دەربازبوویە دەرامەت، و کانزا: زیڤ یان زێر و کانزایێن دی هەتا دراڤان ئەڤ شێوێ نهوو وەرگرتی کو دراڤێ کاغەزیە.

## پێناسا دراڤی:

### دراڤی کۆمەکا پێناسان هەیە، ژوانا:

١- هەر تشتەك ب شێوەکێ گشتی ژ لایێ خەلکیڤە بهێتە پەسەندکرن وەك پیڤەرەك (وسیط) بۆ ئالۆگۆرکرنێ (پێکگوهۆرینێ) و دانا قەران دبێژنێ دراڤ.

٢-دراڤ پێکهاتیە ژ هەر شمەکەکی کو ب ئەرکێ دراڤی رابیت.

گرنگترین ئەرکێن دراڤی پێکهاتینە ژ: هۆکارەکێ بۆ ئالۆگۆرکرنێ، پیڤەرەکە بۆ بهان و یەکەیەکە بۆ حساب کرنێ، و عمبارە بۆ بهان، و ئامرازەکە بۆ پاشەکەوت کرنێ عمبارکرنێ، و هۆیەکە بۆ پێدانا قەرزێن پاشئێخستی و پاکۆکرنێ (گەردەن ئازاکرنێ) (تبرئة الذمم) د ڤێرێدا دەردکەڤت کو دراڤ ب شێوەکێ راستەوخۆ وەك دراڤ بخۆ بۆ تێرکرنا پێدڤی یێن مرۆڤی یێن کاربەری (استهلاکی) و بەرهەمی داخاز ناکەت، بەلکو داخازا وێ دکەت بۆ مەرەما ب کارئینانا وی ژ بۆ ب دەسڤەئینانا مفایەکی (منفعة) چ ب کاربرن بیت یان بەرهەم دار.

ئانکو دراڤ پێدڤی یێن مرۆڤی ژ ب کاربرن و بەرهەمئینانێ ب شێوەکێ نەراستەوخۆ دابین دکەت درێیا ب کارئینانا وی وەك ئامرازەك بۆ ب دەستڤەئینانا شمەك و خزمەتگوزاریان.

## شێوێن دراڤی: Types of mondy

دراف ب شێوێن جودا جودا هەنە ل دویف:

١-ئەو ماددێ کو ئەو دراف ژێ دروستکری.

٢-ئەو لایەنێ کو دەردئێخت.

٣-ئەو پەیوەندییا کو دناڤبەرا بهایێ یەکا دراڤی وەکو دراف و بهایێ وی وەکو مادده (شمەك) و ل دویف وێ چەندێ شێوێن دراڤی ئەڤەنە: دراڤێ شمەکی، دراڤێ کانزا، دراڤێ کاغەزێ و ئەو دراڤێ کو حکومەت و بانکا ناڤەندی دەردئێخت و هەروەسا ئەو دراڤێن کو بانك دەردئێخن (دراڤێ سپاردان: نقود الودائع) .

## ١- دراڤێ شمەکی: Commodity Money

دگەل قۆناغێن دیرۆکێ گەلەك ژ شمەکان وەك پیڤەرەك بۆ بهای ب کاردئینان و دبوارێ ئالۆگورکرنێدا. دیارکرنا ئەوان شمەکان ژ لایێ جڤاکان یا جودابوویە ل دویف جوداهیا ژینگەها وان، بێگومان دبوارێن ئابووری و کۆمەلایەتیدا ئەڤان شمەکان خۆ گونجاندیە دگەل سامان و دارایێ ڤی سەردەمیدا. و هەروەسا ئاستێ هزرکرنێ و حەز و ئارەزویان و رەوشت و تیتال و سروشتی درۆشمێن ئایینی کو دبەر بەلاڤبوون، بوو نموونە دیرۆکا دراڤی بۆ مە دیاردکەت کو (گرێکان)ئاژەل وەك دراف ب کارئینایە، و هند یێن سوور تویتن ب کارئینایە، و چینیا ژی کێرك (چەقوو).

## ٢- دراڤێ كانزا: Metal Money

پشتی كو مرۆڤی كانزا ڤەدیتین و خەسلەتێن وی زانین بۆ مەرەما دراڤی ب كارئینا. بۆ جارا ئێكێ برۆنز و سفر كرە دراڤ، پاشی زیف و ل دوماهی قۆناغێن پێشڤەچوونا جڤاكێن مرۆڤایەتیێ زێر (ئالتون) ب كارئینا چونكی زێر و زیڤ ژەنگی نابن و هەلگرتن و پاشەكەوت كرنا وان یا ب ساناهییە و دبیت بهێتە بەش بەش كرن زێدەباری هندێ كو دكێمن ژی.

## ٣- دراڤێ كاغەزێ: Paper Money ( Banknote )

ئەڤ دراڤێن كاغەزی ژ سێ لایەناڤە دەردئێخن: میریی، بانكا ناڤەندی یان بانكا تایبەت.

١-ئەڤ دراڤێن كو میری دەردئێخیت ل دویف یاسایا دیاركری ب دراڤەكێ دیتر دگوهۆرین ل دویف داخوازیان، ئەڤان دراڤا دبیت بگوهۆرین یان نە گوهۆرین.

٢-بەلێ دراڤێ كاغەزێ كو بانكا ناڤەندی دەردئێخت كو د پرانیا ولاتاندا هەیە یەكا دراڤی دبیت بهێتە گوهۆرین بۆ دراڤەكێ دی ل دویف یاسا و رێنمایان كو كریارێن دراڤ گوهۆرینا (معاملات الصرف لأجنبي) (مامەلێن خەرجكرنا بیانیان) بیانی رێك دئێخن.

٣- بەلێ ئەڤ دراڤێن كو بانكێن تایبەت دەردئێخن د پرانیا ولاتاندا هاتیە راوەستاندن بەلێ ل ولایەتێن ئێككگرتیێن ئەمریكی هەرمایە.

## ٤- دراڤێ بانكی:

پێكهاتییه ژ دراڤێ سپاردن (الودائع) یان دبێژنێ (دراڤێ چەكان) (شیكات) كو درێیا بانكان و هەروەسا تاكە كەسان ب شێوەكێ بەرچاڤ مامەلێ پێ دكەن ژبەر ئەڤ خەسلەتێن پۆزەتیڤی (باش) كو هەین ژ ب ساناهیا هەلگرتن و ڤەگوهاستنێ و مامەلەپێ كرنێ زێدەباری وێ ژی كو بوارێ پشك پشك كرنێ نینە، لەورا ئەم پێدڤی ب هژماران و پشكێن بچووك نینین.

جوداهیا دراڤێ بانكی دگەل دراڤێن دیتر ئەوە كو ڤەوارەكێ مادی و هەست پێكرنێ نینە، هەر چەندە ئەوێن قەرزدار یان بكرنەشێن قەرزێن خۆ یان فروشیاران پا بەندبكەن ل سەر رازیكرنا وان بۆ ژێبرنا قەران و نە هێلانا وان و دانا نرخێ شمەكێن هاتینە كرین، ئەم دبینین ئەڤ جۆرێ دراڤی لایەكێ مەزن ژ خستە روویا دراڤیدا ل وولاتێن پێشكەفتی پێك دئینن.

بەلێ سەبارەت پەیوەندی دناڤبەرا بهایێ دراڤی وەك دراڤ و بهایێ وی وەك شمەك ئەڤجا دراڤان دێ دابەشكەین بۆ:

## ٥- دراڤێ پیڤانەیی:

پێكهاتیە ژ دراڤەكی كۆ پێكهاتەكێ ماددی یێ تمام هەیە چونكی بهایێ وی د بازاریدا وەك شمەك بەرامبەر ئەو بهایێ هەی هەر چەندە ئەڤ جۆرێ دراڤی د بازاراندا نەمایە، كو چ هندەك خەلك هەتا نهوو ب باشترین جۆرێن دراڤی ددانن.

### ٦- دراڤێ باوەرپێكری:

ئەو دراڤن كو بهایێ وان دناڤەرۆكێدا گەلەك مەزنترە ژ بهایێ وی ماددێ ژێ دروستكری. گشت ئەڤ دراڤێن كو ل ددەمێ نهوودا ئالوگۆریێ پێدكەن دراڤێ باوەرپێكری نە (كاغەز بیت یان كانزا یێن ئەرزان بن وەكو سفر و فافۆن و نیكل... هتد).

## ئەركێن دراڤی: Money Functions

دراڤ دوو ئەركان دبینت: ئەركێ ئێكێ دبێژنێ (ئەركێ سەرەكی) یان بنەرەتی چونكی پیڤەرەكە بۆ ئالۆگۆركرنێ و پیڤەرێ بهایە و یەكا حساب كرنێ یە، ئەركێ دووێ دبێژنێ (ئەركێن داتراشین) (المشتقة) یان یێن لاوەكی دیار دكەن كو دراڤ عمبارا بهایانە و ئامرازەكە بۆ عمباركرنێ و هەروەسا ئامرازەكە بۆ پێدانا پاشئێخستیان (المؤجل) و پاكۆكرنێ (گەردەن ئازاكرنێ) (تبرئة الذمم).

دشێن ئەركێن دراڤی ب هویری روون بكەین بڤی شێوێ خارێ:

### ١- دراڤ پیڤەرە بۆ ئالۆگورکرنێ:

ئەڤ ئەركە ئێكەم ئەركە كو دراڤی كری و هەتا نهوو ژی دكەت ئەڤە ژی پشتی مامەلەكرن ب شێوازێ پێكگوهۆرین (تشت ب تشتی) هاتیە گۆرێ، و بن سیبەرا ڤی ئەركیدا ل قۆناغا ئێكێ مامەلەكرنا شمەكان ب دراڤی دگوهارت كو چ ل قۆناغا پاشتر گوهۆرینا دراڤی بوو ب شمەكێن دی.

دشێن ڤی ئەرکی درێیا مامەلەکرنا خۆ یا رۆژانە دا بەرچاف بکەین، تاکە کەسی مووچە و کرییێن خۆ یێن رۆژانە یان یێن هەیڤانە وەردگرن بەرامبەر وەستیان و کارێن خۆ. بەلێ هەمی داهاتێ وان ددەمێ وەرگرتنێدا خەرج ناکەن بەلکو کریارا خەرج کرنێ ل ماو و دەمێ ئێك ل دویف ئێکدا و ب بەردەوامی و هەتا رادەکێ ژێك دویر ئەنجام ددەن (دەسپێکا وەرگرتنا داهاتێ و هەتا دوماهیا خەرجکرنا وی). ئەڤ ئەرکێ دراڤی ل سروشتێ وی دراڤی کو قەبولکری دناڤبەرا لایەنێن مامەلە پێکریدا وەك ئامرازەکێ گونجای بۆ چارەسەرکرنا ئالی و گوریان و قەران، لەورا دبێژنە دراڤی (هێزا کڕینێ).

## ٢- دراڤ پیڤەرە بۆ بها و یەکە یەکە بۆ حساب کرنێ:

د بنیاتدا دراڤ بۆ هندێ دانایە کو نرخ و بهایێ شمەك و خزمەتگوزاریان دیاربکەت. ب رامانەکا دی دبیت بهایێ شمەك و خزمەتگوزاریان بۆ پیڤەرەکێ هەڤپشك ڤەگەرینە ڤە کو ئەو ژی دراڤە، ل سەر ڤی بنەمایێ بەراوردیا رێژەیی دناڤبەرا بهایێ شمەك و خزمەتگوزارییێن جودا جودا دا دهێتە ئەنجام دان. دەمێ کو دراڤ ب ئەرکێ پیڤەرێ بهایان رادبیت پێدڤی یە بهایێ دراڤی هەتا رادەکی یێ چەسپاو وجێگربێت چونکی نابێت هەتا ل سەر ڤی بهایی چەسپای و جێگیر بمینتە ڤە.

مەرەم ژ بهایێ دراڤی هێزا کرینا وییە کو پێکهاتیە ژ بڕا وان شمەك و خزمەتگوزاریان کو دشێت ب دەستڤە بینت ژ ئەنجامێ ئالی و گورکرنێ دگەل ئێك یەکا دراڤی د ماوەکێ دیارکریدا

ل دویف ڤی ئەرکی دبیت دراف ئامرازەك بیت بۆ حساب کرنێ. چونکی کریارا ژمێریاریێ ساناهی دکەت بۆ هندێ دا ب کارێن جورا و جور و جودا جودا ژ قەبارە و بها و کێشانێ رابیت. و پرۆژە و کومپانی و دام و دەزگەهـ رادبن ب بەرهەڤکرنا بوودجێن خۆ ئەو ژی دریپا خەملاندنا ئەو تشتێن هەین و ئەو تشتێن کو دڤێن پشت ب دراڤی کو ببیتە وەك ئامرازەکێ حساب کرنێ.

## ٣- دراڤ کۆمکەرێ بهایانە و ئامرازەکە و بۆ پاشکەوت کرنێ ( الادخار ):

ئەڤ ئەرکێ دراڤی داتراشە (مشتقة) ژبەر هندێ بهایێ شمەکان بۆ ماوەکێ درێژ نەشێن بپارێزن چونکی تووشی ژ ناڤچوون و تێکچوونێ دبن یان نەشێن هەلْ بکرێن لەورا دراف بڤی ئەرکی رادبیت وبهایێن سەرجەم شمەك و خزمەتگوزاریان عمبار دکەت هەڤدەم دبیت ل شینا شمەکێن ماددی و نەماددی کو حەز و ئارەزوییێن تاکە کەسی و گروپان دەستبەر دکەت هەتا ب کاربهێنن. ژبەر هندێ دراف هەردوو کریارێن کڕین و فرۆشتنێ ژێك جودا دکەت د دەمێ ئالْ و گورگرنێدا هەڤدەم رادبیت ب هەلگرتنا بهایێ شمەکان و ب دەستڤەئینانا وان ل ماو و دەمێن پاشتردا -کە ئەڤ چەندە ژی وەدکەت ببیتە ئامرازەك بۆ پاشکەوتکرنێ - ب رەنگەکی هەر بتنێ بۆ پاشئێخستنا کریارا ئالوگورکرنا دراڤی بەرامبەر شمەك و خزمەتگوزاریان بۆ ماوەکێ پاشتر دپاشەرۆژێدا ئەڤە رامانا وێ ئەوە کو دراڤی ئەرکێ پاشکەوتکرنێ ب جهـ گەهاندییە ئەو ژی ژبەر هەلگرتنا بهایێ شمەك و خزمەتگوزاریان د دەمێ دیارکریدا،

گرنگیا چەسپاندن و جێگیربوونا رێژا بهایێ درافی دیار دبیت داکو یێ دویر بیت ژ دابەزینا هێزا تشت پێکرینێ لەورا فاکتەرەکێ گونجای ترە ژ یێن دی بۆ هندێ کو ئەرکێ پاشهەلگرتنێ - عمبارکرنێ - (پاشەکەوتکرنێ) بستوخۆڤە بگریت، ئەو ژی ژ ئەگەرێ هەبوونا باوەرییا (السیولة) تمام لجاف جۆرێن دی کو بکێر پاشکەوتکرنێ (عمبارکرنێ) دهێن.

## ٤- دراڤ ئامرازەکە بۆ دانا ( ڤەگەراندنا ) پاش ئێخستیان:

ئەڤ ئەرکێ درافی کو یێ هاتیە دارژتن شیانێت درافی دیار دکەت د بجهگەهاندنا پێکگوهۆڕینێن پاشئێخستی دگەل پێکگوهۆڕینێن نهۆ -رامانا ڤێ وەسایە کو مەرجێ سەرەکی بۆ هندێ کو دراف ئەرکێ پێگهۆرینێ ببینیت پێدڤییە بشێوەکێ گشتی رازی بیت بۆ دانا قەران و گەردەن ئازاکرنان.

و ژ ئەنجامێ ئەڤان هەمی کار و ئەرکان دراف کریارێن قەران و قەر وەرگرتنێ بساناهی دکەت و بەنك و دەزگەهێن داراییێن دی و کەس « باوەرییێ» ددەنە کۆمپانیان و حکومەت و کەسان، بتایبەتی کۆمکرنا پاشەکەوتی پشکدارییێ د کەلەککرنا (تراکم) سەرمایە و بەرفرەهبوونا وەبەرهێنانێ و بەرهەمی بەرفرەهـ دکەت، بڤی جۆری گرنگیا ئەرکێ درافێ وەك ئامرازەکی بۆ دانا پاشئێخستیان روهن دبیت، لەورا پێدڤییە دراف بهایێ وی هەتا رادەکی یێ چەسپای بیت داکو بشێت بۆ دانا پاشئێخستیان یێ ژێهاتیببیت - چونکی گوهۆڕینا بهایێ درافی کار دکەتە سەر لایەنێ پێگهۆرییان - کو دئەنجامدا دبیتە ئەگەرێ زەرەر و زیانا لایەنەکی و ب مفابوونا لایەنێ دی.

## ئەركێن دینامیكی یێن دراڤی: Dynamic Function of Money

ئەو ئەركن كو دراڤ دشێت پێ رادبیت و كار بكەتە سەر چالاكییێن ئابووری و ئاستێن گەشەبوون و رەنگڤەدانا وان لسەر بهایێ دراڤی و هێزا تشت پێكرینێ -و كاریگەریا وان لسەر بەرهەڤكرنا دەرامەتان و دابەشكرنا داهات و سامانی و هەمی گوهۆرینێن دیتر.

## ساخلەتێن دراڤی: Money Characteristics

پشتی كو بۆ مە روهن بووی كا چاوا دراڤی سەرهلدا و گەشەكر بۆ هندێ سەرەدەرییێ پێ بكەین دژیانا خۆیا رۆژانەدا و هەر وەسا ئەركێن جۆرا و جۆرێن دراڤی مە زانین. دشێین ئەڤ ساخلەتێن كو دراڤێن بەرنیاس هەنە دەست نیشان بكەین:

١- هەردەم داخازا گشتی لسەر هەیە، چونكی خەرجكرنا وی یا بساناهی یە و هەمی كەس درازینە معاملێ (مامەلێ) پێ بكەن.

٢-ئەڤ رازیبوونا گشتی دوێرێدا خۆ دبینیت،كو ئامرازەكێ گونجایە بۆ پیادەكرنا ئەركێن سەرەكی و هۆكارەكە بۆ پێكگوهۆرینێ و پیڤەرەكە بۆ بهایان.

٣-بهایێ وی یێ بلندە لچاڤ وی قەبارێ بچووكێ وی هەی و هەلگرتنا وی ژی یا بساناهی یە.

٤-ئامرازەكێ گونجایە بۆ پاشهەلگرتنێ -عمباركرنێ-(پاشەكەوتكرنێ) دشێی بۆ دەمەكی دویر و درێژ هەلبگری بێی كو توشی زیانێ یان ژ ناڤچوونێ بیت.

٥-دهێتە پشك پشك كرن بێ كو چ تێچوونەك یان كێم بوونەك دبهایێ ویدا یان دهێزا تشت پێكرینێ دا برووی بدەت.

٦-پارێزگاریكرنا دراڤی درێژا وییا جێگیردا -بۆ بهایێ تشت پێكرِینێ وەدكەت پتر یێ بشیان بیت د بجهئینانا ئەركێن وی یێن سەرەكی و دارژتی دا.

٧- یەكێن وی دچەسپاینە (جێگیرن) و بهایێ هەر یەكەكا وی دراڤی دگەل دراڤێن دیێن وەكی ئێك دا وەكهەڤن.

**بیردۆزێن بهایێ دراڤی:** بهایێ دراڤی لبن سیبەرا كۆمەكا قوتابخانێن ئابووری هاتیە شرۆڤەكرن ئەڤ بابەتە بشێوەكێ تایبەت نە ڤەكۆلییە بەلكو دچارچووڤێ بیردۆزەكێ یان كۆمەكا بۆچوونان‌دا لژێر ناڤێ (بیردۆزا بهای) هاتییە، بشێوەكی دی ئەڤان قوتابخانان دویر ژ تێگەهـ و هۆكارێن ئابووریێن دیتر ڤەكۆلین د دراڤیدا ئەنجام نەداینە.

ڤان قوتابخانان ژی لسەر ئەڤێن ل خارێ دابەش دكەین:

## ١- قوتابخانا كلاسیكی:

هزر و بۆچوونێن ئەڤێ قوتابخانێ ل ناڤبەرا سەدێ هەڤدێ و هەژدێ و دەستپێكا سەدێ بیستێ دا دبەربەلاڤ بوون. هزر و بۆچوونا ڤێ قوتابخانێ وەسایە كو بهایێ شمەكی (السلع) ب راددێ تێچوونا وی و كێم هەبوونا وی دهێتە دیاركرن ئانكو ئەڤ دو توخمە (تێچوون و كێم هەیی - الكلفة و الندرة) بنەمایێن سەرەكینە بۆ دیاركرنا بهای و نرخێ شمەكی چونكی تێچوونێن بەرهەمئینانێ دقوناغێن بەرهەمئینانا وی شمەكی دا و كێم هەبوونا دەربرِینێ ل هزرا خستەروویێ ئەڤی شمەكی دكەت - و هەر وەسا دراڤ ژی بهایێ خۆ لسەر هزرا هەردو بنەمایێن (تێچوون و كێم هەیی) دیار دكەت.

لدەمێ کو دراڤ کانزایی بوون تێچوونا وان لگۆر تێچوونا دەرئینانا ئەوی کانزایێ دسرۆشتیدا دهاتە دیارکرن. ئەگەر جوداهیەك دناڤبەرا دراڤی و شمەکێن دیدا هەبیت د دیارکرنا بهایاندا ئەو یا گرێدایە هەر بـ وی دراڤی بخۆڤە دسرۆشتیدا.

داخازی لسەر دراڤی نە ژ بۆ وی دراڤی ب خۆیە، چونکی دراڤ ئێکسەر حەزێن مرۆڤی ژ بکاربرنێ (ب کارئینان) و بەرهەمئینانێ تێرناکەت، بەلکو ئامرازەکە ژ بۆ دەستڤەئینانا شمەك و خزمەتگوزارییان. بەلێ دەربارەی خستەرووی پیڤەرەکێ هەڤپشك هەیە بۆ دیارکرنا بهایێ دراڤی و هەر وەسا بهایێ ئەڤان شمەکێن ئێخستینە رووی. ئەڤ پیڤەرەژی یێ گرێدایە ب برێ خستەروویا دراڤی و برێ خستەروویا شمەك و خزمەتگوزارییان، پەیوەندییەکا بەروڤاژی هەیە دناڤبەرا بهایێ دراڤی و نرخێ شمەك و خزمەتگوزارییان برێکا ئەوی برێ پارەیێ ئێخستیەرووی - ئەڤ پەیوەندییە یا بـ دراڤی ڤە گرێدایە، چونکی پیڤەرەکە بۆ بهایان دەمێ بهایێ یەکا پیڤەری بۆ بهایێن شمەك و خزمەتگوزارییان (دراڤ) کێم دبن، یا پێدڤی ئەوە برێ ئەڤێ یەکێ بهێتە زێدەکرن داکو یەکێن پیڤەری بهێنە پاراستن کو دتمام و گونجای بن دگەل بهایێ شمەك و خستەروویدا، بکورتی ئەڤ دیتنا کلاسیکانە بۆ بیردۆزا بهای کو هەڤبەندی ب بیردۆزا بهایێ دراڤی ڤە هەیە.

## ٢- قوتابخانا كومەلآيەتی (بهایێ كاری):

ئەڤ قوتابخانە داكوكیێ ل هندێ دكەت كو شمەك ژ بۆ پڕكرنا پێدڤیێن بكاربرنێ (استهلاك) و بەرهەمئینانێ دهێنە ئاراستەكرن لەورا دشێین جوداهیێ دناڤبەرا دوو جۆرێن بهایێ شمەكیدا بكەین.

ئێك-بهایێ بكارئینانێ

دوو-بهایێ پێگوهۆڕینێ

## بەلێ ئەو چ تشتە بهایێ شمەكی دیار دكەت؟

لگۆر شرۆڤەكرنێن قوتابخانا كومەلآیەتی- بهایێ ئابووریێ شمەكێ بەرهەمئینای ب برێ ئەوی كارێ كومەلآیەتی یێ پێدڤی ژ بۆ بەرهەمئینانا وی شمەكی دهێتە دیاركرن- برێ بهایێ شمەكی دەمێ كاری دا (وقت العمل) دیار دكەتن-هەر دەمێ بەرهەمئینانا شمەكەكی دەمەكێ زۆر ڤەكێشا دێ بهایێ وی پتر بیت و نەشێی بهایێ ئەڤی شمەكی دیار بكەت بتنێ برێكا هەڤبەركرنێ (المقارنة) نەبیت دگەل شمەكەكێ دی برێكا كریارا پێكگوهۆڕینێ.

بڤی رەنگی دشێین دەربڕینێ ل بهایێ شمەكی بكەین (بۆ نموونە ئاسن) ب رێژا پێگوهۆڕینێ ب شمەكەكێ دیتر (بۆ نموونە گەنم) (١ تەن ئاسن = ٣ تەن گەنم) و ژبەر كو پێكگوهۆڕین دجڤاكێ نویدا برێكا دراڤی دهێتە-ئەنجامدان دا وی ب بارێ پێكگوهۆڕینێ «تشت ب تشتی» ئینا. دشێین نرخێ شمەكان ب دراڤی دیار بكەین - نرخ یان بها: پێكهاتییە ژ دەربڕینا دراڤی بۆ بهایێ وی شمەكی.

ژێدەرێ بهای لگۆر بۆچوونا ئەڤێ قوتابخانێ ب «کار» ی دهێتە دیارکرن و دشێین بهایێ شمەکی ب رێکا دراڤی دیار بکەین کو دەربڕینێ ل بهایێ شمەکی دکەت دبازاریدا، لەورا ئەگەر دراڤ ژ شمەکێن جۆرە و جۆر بهێتە جوداکرن بهایەکێ تایبەت ب خۆڤە نابیت.

ئانکو بابەتێ بهای لگۆر هزر و بۆچوونا ئەڤێ قوتابخانێ ئەوێ روهن دکەت هزرە کەسێ رەهەند هەنە دبێژنێ تێگەهێ تێکەل کو ئەڤەنە:

١- گرێدایە ب بەحسکرنا بهای ب خۆ. ئانکو بهایێ دراڤی بتنێ یێ ب بابەتێ پێکگوهۆڕینێ ڤە گرێدایە. ئەڤ ساخلەتە بتنێ دراڤی یێ هەی و ژ شمەکێن دی جودا دکەتن.

٢- بەرەڤ رۆخسارێ دەرڤەیێ بهای دچیت. ئانکو ب دەربڕینا کو دراڤ و بها یەکەیەکە یان شمەکەکە کو نرخەکی یان بهایەکی دیار دکەت.

٣- بەحسێ ژێدەرێ بهای دکەت، ئەوێ چەندێ روهن دکەت ئەو کییە بهای بۆ شمەکان دانیت؟ دەرکەفت کو کارێ مرۆڤی بهای ژ تشتان دروست کەت. مەبەست ژ کاری ئەو برێ کارێ تێکرایی یە کو ژ روویێ کومەلایەتی ڤە هاتیە داخازکرن و کو خۆ دبهایێ تشتاندا دبینیت کو درێیا هژمارا یەکێن دەمێ پێدڤی دا خۆ دیار دکەت ژ بۆ بەرهەمئینانا یەکەیەکێ ژ شمەك و خزمەتگوزارییان.

## ٣- قوتابخانا سنووردارى:

بۆ هندێ بهایێ یەکا دراڤی لگۆرێ قوتابخانا سنووردارى دیار بیت، ئەڤ قوتابخانە ژ بۆ دیارکرنا بهایێ شمەك و خزمەتگوزارییان پشت ب مفایێ وانڤە گرێبدەت ئانکو شیانێت وان چەندن د پرکرنا پێدڤیێن مرۆڤیدا. هەر وەسا ئەڤ بنەمایە دراڤی ژی ڤەدگریت، بەلێ نابیت رەگەزێن دیژی ژبیر بکەین کو بریارێ لسەر بهایێ گرێدای ب مفایێ بەرهەمی ڤە (قەبارێ بەرهەمئینانێ) ددەت یان دبێژنێ هەڤبەندیێن بەرهەمئینانێ.

قوتابخانا سنووردارى وەسا هزر دکەت کو بهایێ یەکا دراڤی ژی بهەمان شێوە دکەڤیتە دبن کاریگەرییا خەملاندنا کەسایەتیڤە دەربارەی ئەو مفایێ کو دبیت ژ یەکا دراڤی بهێتە دەست.

ڕوبرتسون ئێکە ژ هزرڤانێن ئەڤێ قوتابخانێ دبێژیت: مەرەما مە ژ بهایێ دراڤی بهایێ هەر تشتەکێ تمام و هەڤشێوێ وی دراڤی یە بۆ نموونە (نان و پەڕۆك)، بەلێ ئەوا لڤێرە جودا ئەوە ئەم دشێین بهایێ شمەکان بـ دراڤی دیار بکەین. بەلێ نەشێین نرخێ دراڤی وەك دراڤ ب خۆ دیار بکەین. داکو چارەسەرییا ئەڤان حالەتان بکەین قوتابخانا سنوردارى بەرەڤ هزرا مفایێ پێکهاتییێ دراڤی چوو.

ئانکو بهایێ دراڤی ب رادێ شیان و دەستهەلاتا وی بۆ پرکرنا پێدڤیێن مــرۆڤی برەنگەکێ نە راستەوخــۆ دهێتە پیڤــان. دڤێرەدا قوتابخانا سنووردارى وەسا ددانیت کو دراڤ وەکو ترومبێلەکێ یە یان هۆکارەکێ ڤەگوهاستنێ یە پشــکداریێ د پێکگوهــۆڕینێدا دکەت دنــاڤبەرا شــمەك و

خزمەتگوزارییان-بەلێ بنەمایێ پیڤانێ بۆ بهایان ب وی مفایێ کو ژ یەکا وی دراڤی بدەستڤە هاتییە دهێتە دیارکرن.

شرۆڤەکرنا ڤوتابخانا سنووردارى هەول ددەت چالاکیێن راستەڤینە و چالاکیێن دراڤی بکەڤنە دبن چەنکێ هەمان یاساییێن وێ یێن سنوورداری. کو زەحمەتە یاساییێن بهایێ تایبەت بـ شمەك و خزمەتگوزارییێن ئابووریڤە لسەر بهایێ دراڤی بجهبینین. چونکی دبیت نەشێت دراڤ (شمەك) بیت هەر وەکو شمەکێن دیێن ئابووری. ب رامانەکا هویرتر دراڤ نەشێت بهایێ بکارئینانێ هەبیت هەر وەکو شمەك و خزمەتگوزارییێن ئابووری (بەرهەمئیناى) هەی، هەر چەندە هەتا رادەکی بهایەکێ پێکگوهۆرینا مەزن هەیە، لەورا دشێین بهایێ پێکگوهۆرینا دراڤی ب بهایێ بکارئینانا وی دیار بکەین، بەلێ ب بەروڤاژی نابیتن.

## هەلاوسان- التخضم-: (Inflation)

دیاردا هەلاوسانێ ژ وان دیاردایە کو بەهرا پتر هەڤبەندی ب دیاردێن ئابووری و دراڤێ ئابوورییێن هەڤچەرخێن پێشکەفتی و گەشەکری ڤە هەیە. ب چاڤخشاندن ل پلەیا وەرار و ئاستێ گەشەبوونا کو ئەڤان ئابوورییان هەیە.

ئەڤێ دیاردێ ل داوییا جەنگێ جیهانییێ دووێ (١٩٤٥ و دویڤدا) سەرهلدایە، شێوە و ناڤەرۆکا ڤێ دیاردێ ل سالێن حەفتێیان و هەشتێیا یێن سەدێ بیستێ بتمـــامی بئاشکرایی دەرکەفت. هەر چەندە ئەدەبیـــات و کەلتۆرێ

ئابووری یێ پره ژ بابەتێن گرانیێ و بلندبوونا نرخان، بتایبەتی ئەو کێشێن کو جڤاکێ ئەوروٚپی ل هەر دو سەدەیێن شازدێ و هەڤدێ و دویڤدا ژی ولاتێن دی توشبووینێ.

**هەلاوسان:**

**ئانکو بلندبوونا زێدە و بەردەوامە ل ئاستێ گشتیێ نرخان ل دەمەکێ دیارکری کو ئەو دەم ژی یێ کورت بیت.**

هەر بلندبوونەك دنرخاندا رامانا هەلاوسانێ نادەت. بەلکو هەلاوسان بلندبوونا نرخانە.

لەورا هەلاوسان راستەوخوٚ یا گرێدایە ب بلندبوونا زوٚر و بەردەوام دئاستێ گشتیێ نرخاندا دماوەکێ دیارکریدا. بەلێ بلندبوونا رێژەیی بوٚ هندەك شمەك و خزمەتگوزارییان بوٚ ماوەکێ دیارکری، مەرج نینە حالەتێ (دوٚخێ) هەلاوسانێ بیت یان دبیت هوٚکارێن روویدانا وی حالەتی نە ئەو هوٚکارن کو دبنە ئەگەرێ سەرهلدانا هەلاوسانێ. هەر وەکی ل وەرزێن نەهاتیێن چاندنێ یان کێمبوونا بەرهەمئینانێ بێی کو هێزا بەرهەمئینانێ بهێتە دابینکرن و یان گوهوٚڕینا تەکنولوٚجی یا هونەری و یان گوهوٚڕینا باجێ و هەڤکارییێن حکومەتێ و چەندین هوٚکارێن دی.

هەر وەسا دشێین هەلاوسانێ پێناسە بکەین:

_ بڕەکا مەزن ژ دراڤی لبەرامبەر بڕەکا کێم ژ شمەك و خزمەتگوزارییان.

_ زێدەبوونا وی بڕێ پارەی کو جڤاك ئالوگوٚڕیێ پێ دکەت.

_ زێدەبوونا خواستێ لسەر ئەوان شمەك و خزمەتگوزارییێن هەیی و لسەر داهاتێ راستەڤینە ژی.

## جۆرێن هەلاوسانێ: Types of Inflation

گرنگترین جۆرێن هەلاوسانێ ئەڤەنە:

### ١- هەلاوسانا خشۆك: Creeping Inflation

بەردەوام بلندبوونا ئاستێ گشتییێ نرخانە، بەلێ برەنگەکێ لسەر خۆ، ئانکو زێدەبوونا نرخی یا لسەر خۆ و پلە پلەیە، ئەڤە کێمترین ئاستێن هەلاوسانێ یە لەورا لچاڤ جۆرێن دیێن هەلاوسانێ ماوەکێ درێژ ڤەدکێشیت، بۆ نموونە بلندبوونا نرخان ل ماوێ دەهـ سالان ب رێژا ١٠٪ یە، ئانکو تێکرایێ زێدەبوونا سالانە دبیتە ١،٥٪ ئانکو ئەڤ جۆرە هەلاوسانە ئاماژە ب لڤینا بلندبوونێ یە ل ئاستێ گشتییێ نرخاندا و ب ئاستەکێ بەردەوام و مام ناڤنجی کو ل ناڤبەرا ١٪ بۆ ٣٪ یێە.

### ٢- هەلاوسانا بێدەنگ کری (هەست پێ نەکری): Suppressed Inflation

ئەڤ جۆرێ هەلاوسانێ ب زێدەبوونا نرخان ڤە یا گرێدایە کو چێدبیت روویدا بایە ئەگەر دەستێوەردانا میری نەبایە کو ژبەر سەپاندنا چاڤدێریێ لسەر نرخان و هەڤکاری و پشتەڤانیکرنا نرخان بۆ چەند شمەکەك و خزمەتگوزارییەکێێن سەرەکی و پەیرەوکرنا سیستەمێ پلێتێن ئاهێت خوارنێ. لەورا زێدەبوونا نرخان هەست پێ ناهێتە کرن چونکی حکومەت ب پێرابوونێت خۆ (دابەشکرنا شمەکان) ئەوێ زێدەبوونا راستەڤینە یا کو ل نرخان بشێوێ مەزاختنا دراڤی دبازارێ ڕەشدا دیار دبیت ژناڤ بەت لەورا حکومەت ب نەچاری پاپەند دبیت.

ب ئەڤان نرخێن زێدەبووی کو دبەرامبەردا پێدانا دراڤی زۆر دبیت و دبیتە ئەگەرێ زێدەبوونا خواستێ لسەر شمەك و خزمەتگوزارییێن جودا جودا.

## ٣- هەلاوسانا ژ راددەی ڤەدەر (سەرکێش): Hyper Inflation

ئەڤ جۆرێ هەلاوسانێ ب بلندترین ئاستێ زێدەبوونا نرخان دهێتە دانان، ب جۆرەکی نرخ ب بەردەوامی و ب پلەکا گەلەك بلند زێدە دکەن، دئەنجامدا ژی دبیتە ئەگەرێ هەلوەشیانا سیستەمێ نەختینەیی (کاش) (دراڤ) ژ ئەگەرێ ئەو شکەستنا دژوار یا دراڤی کو ل بهای و هێزا تشت پێکرپنێ رووی ددەت، و پارێ نیشتیمانی هەمی باوەرپێدانەکێ ژ دەست دەت. لەورا کەسان وەسا پێ باشە هەر شمکەکی یا کەلوپەلەکی هەلبگرن ل شوینا دراڤی، چونکی ئەگەر بەردەوام نرخێ شمەکان زێدە بکەت دێ بیتە ئەگەرێ دابەزینا بهایێ پارێ نیشتیمانی، و بەردەوام ژ دەستدانا هێزا تشت پێکرپنێ و هەلگرتنا پارەی، و پارێ نیشتیمانی ئێك ژ ئەرکێن گرنگێن خۆ وەکو کوگەها (عمبار) بهای (کۆمکرنا بهای) ژ دەست ددەت، ئەڤەژی وەدکەت خواست حەز لسەر بکارئینانا دراڤی بۆ نزمترین ئاست کێم ببیت، لبەرامبەر زێدەبوونا خواستێ لسەر شمەك و خزمەتگوزارییێن جۆرە جۆر، کو بەردەوام نرخێ وان بلند بیت، ژبەر کو ئەڤ جۆرێ هەلاوسانێ بـ ترسناکترین جۆرێن نرخ هەلاوسانێ دهێتە دانان چونکی گەفێ ل قەوارێ ئابووری و دراڤی یێ دەولەتێ دکەت.

## پرسیارێن پشكا چارێ

پ١/ ئەڤان زاراڤێن ل خارێ بناسینە (پێناسە بكە):

دراڤ _ دراڤێ پیڤانەیی _ دراڤێ باوەرپێدانێ _ بهایێ دراڤی _ هەلاوسان _ دراڤێ ئەلكترۆنی _ دراڤێ هژمارەیی (دراڤێ كاشی یان دیجیتال)

پ٢/ بەرسڤا ئەڤان پرسیارێن ل خارێ بدە:

١-دراڤی چەند جۆرەك هەنە، بەحس بكە.

٢-بەحسێ ئەركێن دراڤی بكە.

٣-ساخلەتێن دراڤی چنە؟

٤-بهایێ یەكا دراڤی گەلەك ناڤا دبێژنێ دەستنیشان بكە.

٥-ژێدەرێن سەرهلدانا هەلاوسانێ ل وڵاتێن تازپێگەهشتی چنە؟

٦-ئەو لایەنێن دراڤێ كاغەزێ دەردكەن بهژمێرە.

٧-بەحسێ جۆرێن دراڤی بكە لگۆر پەیوەندییا دناڤبەرا بهایێ دراڤی وەك دراڤ و بهایێ وی وەك شمەك.

پ٣/ ئەرێ ئەڤ ڕستێن ل خارێ دراستن (√) یان دخەلەتن (دشاشن) (× )؟

١-دراڤی ب خۆ خواست لسەر نینە بەلكو ب مەرەما بكارئینانا وی بۆ بدەستڤە ئینانا شمەك و خزمەتگوزارییانە.

٢-مەرج بۆ شیانێن دراڤی هەتا كو ببیتە ناڤەندەك بۆ (پێگوهۆڕینێ) ئەوە كو بگشتی رازیبوونێ وەربگریت بۆ دانا قەرز و گەردەن ئازاكرنێ.

٣- هەڤبەندییەكا بەروڤاژی لناڤبەرا بهایێ دراڤی و نرخێ شمەك و خزمەتگوزارییان برێكا قەبارێ دراڤێ خستەروویدا هەیە.

٤-سنووردارییان باوەرییا وان وەسایە كو دراڤ وەك ئامیرەكێ ڤەگوهاستنێ یە و پشكدارییێ دكەت د پێكگوهارتنا شمەك و خزمەتگوزارییاندا.

## ژێدەرێن بەشێ چوارێ


١- د. احمد حسين علي الهيتي، اقتصاديات النقود و المصارف، جامعة الموصل، دار ابن الأثير للطباعة و النشر، الموصل، ٢٠٠٥.

٢- جمال خريس و ايمن ابو خضير و عماد خصاونة، النقود و البنوك، الطبعة الاولى، دار المسيرة للنشر و التوزيع و الطباعة، عمان، ٢٠٠٢.

٣- د. عوض فاضل اسماعيل الدليمي، النقود و البنوك، جامعة بغداد،مطابع دار الحكمة للطباعة و النشر، بغداد، ١٩٩٠.

٤- د. محمود يونس و د. عبدالنعيم مبارك، اقتصاديات النقود و الصيرفة، مؤسسة شباب الجامعة،الاسكندرية،١٩٨٢.

٥- د. ناظم محمد نوري الشمري، النقود و المصارف، جامعة الموصل، مديرية دار الكتاب للطباعة و النشر، الموصل، ١٩٨٨.

٦- د. صبحي تادرس قريصة، النقود و البنوك، دار الجامعات المصرية، الاسكندرية، ١٩٨٨.

٧- د. عبدالمنعم السيد علي، اقتصادات النقود و المصارف، الجزء الأول، الطبعة الاولى، الجامعة المستنصرية، مطبعة الديواني، بغداد، ١٩٨٦.

٨- د. محمد احمد الرزاز، محاضرات في النقود و البنوك، دار الحمامي للطباعة، القاهرة، ١٩٧٤.

٩- د. كامل البكري، الاقتصاد التجميعي، مؤسسة شباب الجامعة للطباعة والنشر، الاسكندرية،١٩٨٥.

١٠- د. اكرم حداد و مشهور هذلول، النقود و المصارف، مدخل تحليلي و نظري، دار وائل للنشر، عمان، ٢٠٠٥.

١١- د. احمد حسين الرفاعي و د. خالد واصف الوزني، مبادئ الاقتصاد الكلي بين النظرية و التطبيق، الطبعة الثانية، وائل للطباعة والنشر، عمان، ١٩٩٧.

12- M.L.Burstein, “Modren Monetary Theory”, Mac Millan Press Inc, London,1988.

13- Klaus F.Zimmermann, “Fronteers In Economics” Springer, 2002.

14- Richard Coughlan, “The Theory Of Money and Finance” Mac Millan Press Inc, london, 1986.

15- Paul Hallwood and Ronald Macdonald, “International Money: Theory, Evidence and Institution” ,Basil Blackwell Inc, 1988.

# پشکا پێنجێ

## بانك
## Bank

بانك ئەو دەزگەهێن کو ئێك ژ ئەركێن وان یێن سەرەكی باوەری پێدانە ب پێگوهۆڕییان ئەڤجا چ كەس بن یان پرۆژە. و دەزگەهەك مامەلێن قەر و بازرگانی پێ دكەن.

بانك ل سەر پاشماوێن كۆمەكا رەوشت و تیتالێن سەر دەمێ بەراهییێ هاتیە دامەزراندن. كو دەستپێكێ كارێ باوەری پێدانێ (الأئتمان) ب شێوەكێ سادە بڕێكا مەزنە بازرگان و زێڕنگران و مفاخوڕان (المرابین) ب رێڤە چوون. ئێكەمێن كار كو بانك پێ رابووی پێكهاتی بۆ ژ قەبولكرنا سپاردێن پێكگوهۆڕینا ل سەر بنەمایێ قەر وەرگرتنێ و سۆزدان بۆ دانا وان قەران پاش دەمەكێ دی ئەڤجا قوناغەكا دی بەرەف پێش چوو دەمێ خەلكی دەست ب وەرگرتنا قەران ژ وان سپاردیان. بڤێ ژی هەر دوو كریارێن ((دانا قەران و وەرگرتنا قەران پێكڤە كۆم كرن)) ئەڤە ژی دەستپێكەك بوو بۆ ڕێكخستنا باوەرییێ و گەشەپێدانا وێ بۆ هندێ باشترین شێوە ب خۆڤە دگریت كو شێوێ دروستكرنا سپاردان و پێكهاتێن سپاردان (الودائع و الودائع المشتقة).

ب بۆرینا دەمی سیستەمێ بانكی گەشە كر ئەركێن وان هەمە جۆر بوون مل ب ملێ بانكێن بازرگانی (ل دویف هندێ كو ئێكەم دەزگەهـ بوون بۆ پارەداركرنا بازرگانی (التمويل التجاري) دروست ببوون) بانكێن

دی دامەزران کو هەر ئێك ژ وان ب جۆرەکێ دیارکری باوەری پێشکێش دکر.

ئەڤ بانکە دو ئەرکێن سەرکی پەیدا دکەت:

**ئێك:** ئەرکێ دراڤی یان نەختینەیی (Money Function) بوو کو ئەو ب خۆ ل قەبولکرنا سپاردان و پێدانا قەران و دروستکرنا سپاردان و دەرکرنا دراڤێ کاغەزێ دیار دکەت.

**دوو:** ئەرکێ پارە دانێ (Financing Function) بوو کو بانك ب رێکا پێدانا پارەی بۆ وان پرۆژان کو پێدڤی پێ هەیە، ئەڤجا چ ب مەرەما دامەزراندنا وان دا یان بۆچوونا ناڤ قوناغا بەرهەم ئینانێ یان بۆ پێشئێخستنا بەرهەمێن وان بیت.

دامەزراندن و گەشەپێدانا دەزگەهێن بانکی یا گرێدای بوو ب گەشەپێدانا سێستەمێ سەرمایەداری. سەرهلدانا زێرنگران ل داویا سەدێن ناڤین دا ل ئەورۆپا (هەر وەکی ل سەری دا ئاماژە پێ هاتیە کرن) دەستپێکا راستەقینە یە بۆ چالاکیا بانکێن باوەری پێدانێ و وەبەرهێنانێ. ئەڤ چالاکیە قوناغ ب قوناغ مل ب ملێ ئەوێ گەشەیا ئابووری و جڤاکی یا بەرفرەهـ کو سێستەمێن ئابووری دوی دەمی دا ب خۆڤە دیتی هەتا ئەڤرۆ.

ئەو چالاکیێن باوەری پێدانێ کو زێرنگران پیادە دکر بۆ بنیاتێ بنجینەی یێ سەرهلدانا بانکێن بازرگانی بوو و باشتر بوو و بنەمایێ سەرهلدانا بانکێن ناڤەندی کو ئەرکێ رێکخستن و چاڤدێریا چالاکیێن بانکی و باوەری پێدانێ ب ستویێ خۆڤە گرتبوو زێدەباری قورخ کرنا (ئیحتیکار) دەرکرنا دراڤی و ئەرکێن دی کو ژ لایێ حکومەتێ ڤە پێ هاتیە سپاردن.

## جۆرێن بانكان: Types of Banks

هەر وەكی ل سەری هاتیە دیاركرن جۆرەها بانكێن جودا جودا هەنە ئێك ژ وان كا ر و ئەركەكێ دیاركری پیادە دكەت و بقی شێوێ ل خارێ:

## ئێك: بانكێن بازرگانی: Trad Banks

ئەو دەزگەهێن كو سپاردان ژ كەسان و دەستەكان وەردگرن بۆ خواستێ ژێر دەست و پاشینە ئەڤجا ڤان سپاردان بۆ پێدانا قەر و پێشینەیا قەری (سلفة) دهێتە بكارئینان.

ئانكو ئەڤ دەزگەهە مامەلێ ب باوەریا دەم كورت دكەن ب مەرەما دەستڤەئینانا دوو ئارمانجان.

١-دابینكرنا پاشكەوتێن ناڤخۆ بۆ یەكێن ئابووری، كەس بن یان كۆمپانیان یان دەزگەهـ و بریكاران.

٢-پێشكێشكرنا قەر و ئاسانكاریێن دی بۆ یەكێن ئابووری.

بانكێن بازرگانی باوەری پێدانێ دروست بكەت دێ پشتێ ب چوار پیڤەران گرێدەت ئەو ژی:

١-كەسایەتیا قەر وەرگری.

٢-سەرمایێ قەروەرگری.

٣-شیانا دارایا قەروەرگری.

٤-دەستەبەری (الضمان).

## ئەركێن بانكێن بازرگانی :

دشێین ئەركێن بانكێن بازرگانی بڤی شێوێ ل خارێ بئێخینە بەرچاڤ:

١-وەرگرتنا سپاردان.

٢- پێدانا قەران و ئاسانكارییێن باوەریێ كو ددەستپێكێ دا بتنێ داشكاندنا كۆمپیالێن بازرگانی بۆ وەرگرتنێ ددەمێ شایستە (هەژی) بوونا وێ دا.

٣-ڕەخساندنا (بكارئینانا) دراڤێ بانكی بۆ پشكداری كرن ل زێدەبوونا چالاكیێن ئابووری.

## كۆمپیالە :

پێكهاتیە ژ كاغەزەكێ كو خودانێ قەری دەردئێخیت تێدا فەرمانێ ب سەر قەرزداری ب خۆدا ددەت كو پارەكێ نەختینەیێ (كاش) دیاركری ل بەروار و ڕۆژا دیاركری ل سەر كۆمپیالێ دهێتە نڤیسین بدەتە هەلگرێ كاغەزێ (وێ كۆمپیالێ) ئانكو (كۆمپیالە كاغەزەكا بازرگانییە).

## كۆمپیالا داشكاندنێ:

دەمێ بانك (كۆمپیالێ) بۆ دبەن وەردگریت و قبول دكەت بەری تەمام بوونا ماوێ وی قەری ل جهێ وی ئەو قەردار بهایێ وێ كۆمپیالێ ددەت بەلێ ب دەست خۆ ژی ڤە بڕەكێ پارە بۆ وی دادشكێنیت (لێ دبۆڕیت).

## پشك ( سهم ):

((پێكهاتیە ژ كاغەزێ: كو تێدا پشكا سەرمایێ كەسەكی د وی پرۆژەی دا دیار دكەت و هەمی كەس ل دویڤ وێ (پشكێ) كو یا هەی دوی پرۆژەی دا (قازانج) و (زەرەر) بەردكەڤیت و پشك دبازارێ مال و دارایدا كڕین و

فرۆشتنێ پێ دهێتە کرن مولکداریا پشکان ژ کەسەکی ڤەدگوهێزیت بۆ کەسەکێ دی))، نموونە ئەگەر ڤەبارێ سەرمایێ کۆمپانیا (تۆیۆتا) پێك هاتبیت ژ (١٠٠ پشکان) و کەسەکی (٢ پشك) بـ (٤٠٠٠٠ $) ژ کۆمپانیا (تۆیۆتا) بکڕیت دێ ئەڤ کەسە ل دویڤ وێ پشکێن کو هەین ژ سەرمایێ وێ کۆمپانییێ (قازانج) و (زەرەر) بەردکەڤیت و ئەڤ کەسە دشێت (پشکێن) خۆ بفرۆشیت ل بازارێ مال و دارایی ب وی نرخی کو کری یان یان زێدەتر یان کێمتر.

## ڤەبالە ( سەنەد ):

((پێکهاتیە ژ کاغەزەکێ کو ڤەر وەرگر دەردکەت ئەڤجا ڤەردار چ (بانکێن بازرگانی) بن یان کەسانێن خەلکی یان حکومەت بیت کو دڤێ کاغەزا بازرگانی دا ناڤێ وی کەسی و بڕێ ڤەری و نرخێ مفایی و ماوێ دانا ڤەری تێدا هاتیە تۆمارکرن ئەڤ کاغەزە کڕین و فرۆشتن پێ دهێتە کرن ئانکو مولکداری ژ کەسەکی بۆ کەسەکێ دی دهێتە ڤەگوهاستن))

## دروست کرنا سپاردان ( الودائع ):

هزرا دراڤێ سپاردان: بانکێن بازرگانی باوەری پێدانا خۆ ب دو ڕێکا پەیدا دکەن:

١-ئەگەر هات و ئەو بانك بڕێ ڤەری بـ ئێك جار یان چەند جاران بـ شێوێ دراڤێ یاسایی ژ وی دراڤێ هەی بدەتە ڤەر وەرگری، دڤی حالەتی دا ئەوا کو رووی ددەت بتنێ کریارا ڤەگوهاستنا بڕێ ڤی دراڤی ژ بانکێ بۆ دەستێ ڤەروەرگران بێ هندێ چ گوهۆڕینەك ل سەرجەمێ بڕێ وی دراڤێ خستەروویدا (بکارئینان) رووی بدەت.

٢- بانك مافى دەتە قەروەرگرى كو ئەوى برێ قەرى لسەر رێكەفتین ب ڕێكا چەكى (صك _ Cheques) یان ئەوێن دهێنە ڕەوانەكرن (Transfers) ئەوى برى بكێشیتەڤە. دڤى حالەتى دا قەروەرگرى بۆ وى هەیە ئەڤى برێ پارەى بـ ڕێكا چەكان بۆ دانا شمەك و خزمەتگوزارییان ب كاربینیت هەر وەكى دراڤى یاسایى بكاربینیت. بڤێ رێكێ هندەك ژ پێدانان (المدفوعات) بێ بكارئینانا دراڤێ یاسایى هاتە ئەنجام دان، ئەڤەژى بـ كارئینانا دراڤێن دى كو ئەوێ بانكێ دروست كرینە ئانكو دراڤێ سپاردان (Mony Deposits) كو بانك ب ئاستەنگێن ژمێریارى د تۆمارێن خۆدا دروست كرین دڤى حالەتى دا برەكێ دى ژ ڤى دراڤى ژ جۆرەكێ دى ئێخستنە سەر برێ وى دراڤێ یاسایى، دبێژنە ڤێ ژى (دراڤێ سپاردان) كو بانكێ دروست كرینە دئەنجام دا دبیتە ئەگەرێ زێدەبوونا برێ دراڤێ كۆم كرى ئێخستیەرووى.

## دوو : بانكێن ناڤەندى: Central Banks

بانكێن ناڤەندى (المركزي) ئەو بانكێن كو بـ كو پیتكا سێستەمى بانكى دهێنە دانان چ ل بیاڤێ دەركرنا دراڤى بیت یان ل بیاڤێ چاڤدێریێ سەر كریارێن بانكێن دى. و هەر وەسا (پێكهاتیە ژ دەزگەهەكێ گشتى كو پتر گرنگیێ ب مامەلەكرنێ ددەت دگەل دەزگەهان نەك دخەلكى دا). ئەوا بەربەلاف هەر ولاتەكى بانكەكا ناڤەندى یاهەى ژ بلى ویلایەتێن ئێكگرتیێن ئەمریكا كو پتر ژ دوازدە بانكێن تایبەت ب دەركرنا دراڤى یێن هەین و ل بن چاڤدێریا جڤاتەكا فیدرالى، بانكا ناڤەندى دەزگەهەكە مەرەما وێ یا سەرەكى قازانج كرن (مفا وەرگرتن) نینە.

گەلەك جاران دێ بینین بانكا ناڤەندی وەكی بانكەكا بازرگانیا یا گرنگ دهێتە دامەزراندن كو حكومەت دەستهەلاتا دەركرنا دراڤی پێ ددەت هەر وەكی ل سالا ١٨١٤ز ل هولەندا پیادە كری و ل ئینگلترا ل سالا ١٨٤٤ز و فرەنسا ل سالا ١٨٤٨ز و ئەلمانیا ل سالا ١٨٧٥ز و ئەمریكا ل سالا ١٩١٤ز و ل عیراقێ ل سالا ١٩٤٧ز هەبوو.

بۆ پتر روهنكرنا بانكا ناڤەندی دبێژین: پێكهاتیە ژ كۆمەكا دەزگەهێن دراڤی و پێكهاتێن وێ كو مەرەما وان ئەنجام دانا كۆمەكا ئارمانج و پیادەكرنا كۆمەكا ئەركان بۆ رێڤەبرن و نەخشەدانانا سیاسەتا نەختینەیی (نەقدی).

**سێ هزر و بیرێن تایبەت ب دیاركرنا تێگەهێ بانكا ناڤەندی هەنە :**

١- **كۆما ئێكێ:** باوەریا وان ئەوە كو بانكا ناڤەندی ئەو دەزگەهە كو چاڤدێریا بانكێن دی دكەت بـ شێوەكی هاریكاریا بجهئینانا سیاسەتا نەختینەیی دكەت.

٢- **كۆما دووێ:** باوەریا وان ئەوە كو بانكا ناڤەندی ئەو دەزگەهە كو هەولا پاراستنا جێگیربوونا رێسایا دراڤی ددەت بتایبەتی ل چاڤدێریا ب كارئینانا دراڤان.

٣- **كۆما سییێ:** باوەریا وان ئەوە كو بانكا ناڤەندی ئەو دەزگەهە كو رێك پێ دهێتە دان ئەركێ قەبارێ دراڤی و باوەری پێدانا ئابووری رێكبێخیت.

بانكێن ناڤەندی سیاسەتێن خۆ ب رێكا كۆمەكا ئامرازێن چەنداتی و چاوایەتی ڤە (الادوات الكمية و النوعية) پەیرەو دكەن:

أ- ئامرازێن چەندایەتیێ گرێدایینە ب یەدەگێ یاسایی، و نرخێ داشکاندنێ، وکریارێن بازارێن ڤەکری و کریارێن گەردەن ئازاکرنێ.

ب- ئامرازێن چاواتیێ: ئەڤ ئامرازە کو گرێدایە ب سەرنج ڕاکێشانێ و ئاراستەکرنا ڕاستەوخۆ و نا ڕاستەوخۆ و دیارکرنا رێژێن باوەری پێدانێ بێ ڕابوونێن قەردانێ و مفایێ.

## ئەرکێن بانکێن ناڤەندی:

بانکێن ناڤەندی سێ سالۆخەت هەنە کو دهەمان دەمدا ئەو سالۆخەت ئەرکێن سەرەکییێن ڤان بانکانا:

### ١- بانکا ناڤەندی بانکا دەرکرنا دراڤی یە:

بانکا ناڤەندی دیرانیا ولاتاندا ل دویف یاسایا تاکە فورخکەرێ دەرکرنا دراڤی یە، ل دویف ڤێ پلەکا وەسا یا هەی دشێت چاڤدێریەکا کاریگەر هەبیت ل سەر پارەی دا دپێك گوهۆڕینێ دا دناڤبەرا خەلکی دا، و بریارێ ل سەر وی برێ پارەی ددەت بۆ مەرەما مامەلەکرنێ و یەدەکی و پێك گوهۆڕینێ ب کاردئینیت ل دویف یا پێدڤی. ل سەر بانکا ناڤەندی پێدڤییە برێ ئەوی پارەی دابین بکەت بۆ پارەدانا (تمویل) چالاکیێن ئابووری گرێدایینە ب رێژەکێ نەبیتە ئەگەرێ هەلاوسانا نەختینەی (التضخم النقدي).

### ٢- بانکا ناڤەندی بانکا بانکانە:

دبێژنە بانکا ناڤەندی (بانکا بانکان) چونکی بتنێ مامەلێ دگەل بانکان دکەت ل دویف کەسان، ژ چوار چوڤێ ئەڤی ئەرکی بانکا ناڤەندی دووماهی پەنایە کو بانك هەر دەمێ پێدڤی بوون پەنایێ بۆ دبەن، چونکی بانك سپاردێن خۆ ل ڤێ بانکێ هەلدگرن وەکی (یەدەکەیەکێ یاسایی)

هەر وەسا هەر پێدڤی ب دەرامەتی هەبوو ئەو ڕادبیت ب دووبارە داشکاندنا ئەوێ کاغەزا بازرگانی‌کو بانکان هەنە، و هەر وەسا ڕادبیت ب کریارا گەردەن ئازاکرنا ژمێریاریا بانکان ب مەرەما ڕاستکرنا ژمێریاریان ئەڤە ژی ژ ئەنجامێ مامەلەکرنێ دناڤبەرا وان بانکاندا هەی، بڤی جۆری بانکا ناڤەندی چاڤدێریا بانکێن بازرگانی دکەت.

دشێت کونترۆلا یەدەکێ دراڤی بکەت و پاشی و دشێت قەردانێ و دروستکرنا دراڤی بزانیت، ئەو ژی ب ڕێکا سێ ئامرازان:

١-گوهۆڕینا ڕێژا یەدەکێ یاسایی.

٢-کریارێن بازارێ ڤەکری.

٣-گوهۆڕینا نرخ داشکاندنێ.

## ٣- بانکا ناڤەندی بانکا دەولەتێ یە :

بانکا ناڤەندی وەکی برێکارێ دارایێ حکومەتێ کار دکەت، چونکی سپاردێن حکومەتێ دپارێزیت و ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی ل ناڤ وڵاتی و دەرڤە ڤەدگوهێزیت. و هەر وەسا کڕین و فرۆشتنا کاغەزێن دارایی بۆ کیستێ حکومەتێ و هاریکاریێ دکەت بۆ دەرکرن و بازارگێریا (التسویق) پسۆلێن حکومەتێ (السندات الحکومیە) و هەر وەسا پێدانا مفای و ب دەستڤەهاتیان، و ژهەمیا گرنگتر ئەوە کو بانك ڕادبیت ب نەهێلانا وان کاریگەریێن زیان بەخش کو دبیت کاری بکەتە سەر بارێ دارایێ حکومەتێ د ئابوورێ

نیشتیمانیدا کو ژ ئەنجامێ خەرجیێ حکومەتێ و باجا زۆر روی بدەت، هەر وەسا ئەو قەرێن مەزن پێن کو دکەت.

## سێ: بانکێن تایبەتمەند:

ئێك ژ چالاکیێن هەرە گرنگێن بانکێن تایبەتمەند پێکهاتیە ژ پارەدانا کەرتێن جۆر ب جۆرێن ئابووری. ئێکەم بانکا عیراقی یا تایبەتمەند پێکهاتبوو ژ بانکا (چاندنێ _ پیشەسازی) کو ل سالا ١٩٣٥ز هاتیە دامەزراندن، بەلێ زێدەبوونا چالاکیێن بانکی و بەرفرەهـ بوونا کریارێن پارەدانا کەرتێن چاندنێ و پیشەسازی وەکر حکومەت ئەڤێ بانکێ دابەش بکەت. و یا ئێکێ بۆ بانکا چاندنێ و یا دووێ بۆ یا پیشەسازی، ئەڤ بانکە ب رێکا پێشکێشکرنا قەر و ئاسانکاریان دشێن کاریگەریەکا مەزن ل سەر چالاکیێن ئابووری هەبیت.

**بانکێن تایبەتمەندێن عیراقێ ئەڤێن خوارێنە:**

### ١- بانکا چاندنێ:

ئەڤ بانکە ل ١/٤/١٩٤٦ز ژ بانکا چاندنێ و پیشەسازیێ جودابوو و بۆ بانکەکا سەربخۆ، چالاکیا پارەدارکرنا کەرتێ چاندنێ ب ستوییێ خۆڤە گرت، ئەوژی ب رێکا پێدانا قەر و پشینەیان (سلف)، هاریکاریا کۆمەلێن هەرە وەرزیێن چاندنێ بۆ ب دەستڤەئینانا مەرەمێن وان و ل سەر ئاستێ عیراقێ چەند لقێن هەین، بەلێ دڤان سالێن داوییێدا رۆلێ وێ سنووردارکر ئەوژی پەیوەندی ب رەوشا عیراقێ یا گشتی ڤە هەیە.

## ٢- بانکا پیشەسازی:

ئەڤ بانکە ل سالا ١٩٤٦ز پشتی جودابوونا وێ ژ بانکا چاندنێ و پیشەسازیێ هاتە دامەزراندن، مەرەم ژی ژ دامەزراندنا ڤێ بانکێ گەشەپێدانا کەرتێ پیشەسازیێ ل عیراقێ بوو، ئەوژی ب رێکا پێشکێشکرنا قەرێن ناڤنجی و قەرێن دەم درێژ ژ پێخەمەت دامەزراندن و بەرفرەهکرنا پرۆژێن پیشەسازی، و ناڤەندەك بیت بۆ فرۆشتنا بەرهەمێن وان ژناڤدا و ژدەرڤە. هەر وەسا وەرگرتنا سپاردان و باوەری پێدانێ و ڤەکرنا ژمێریاریا رەوان بۆ مامەلەچیان (العملاء) و خودان پرۆژێن پیشەسازی و هەر وەسا ل پرانیا پارێزگەهێن عیراقێ لق یێت هەین.

## ٣- بانکا خانووبەران:

ئەڤ بانکە ل نیڤا سەدێ بیستێ وەك پێدڤیەك سەرهلدا ئەوژی ژ بەر بلندبوونا کریا خانیان و کێمیا ژمارا خانیان ل چاڤ ئەوێ خواستنا زۆر ل سەر ئاکنجیبوونێ هەی، زێدەباری ئەوی نرخێ مفایێ کو بانك ل سەر سەرمایێ وی قەرداری ددانیت و زۆریا بارمتان (الرهن) ب نرخەکێ بلند ژ مفا خوارن، لەورا داخاز هاتە کرن ئەڤ بانکە بهێتە دامەزراندن ئەرکێ وێ پێکهاتبوو ژ قەرپێدانێ بۆ عیراقیان بڤی برێ پارەی کو جهێ پشت راستیێ بیت بۆ مولکداریێ یان بۆ مافێن وان یێن جهگرتی یێن دی.

## چوار: باوەری پێدان (الائتمان) Credit

بەراهیێ مە ئەو روهن کر کا چاوا دراڤی سەرهلدا ئەو ئەرکە ژی چ بوون ئەوێن پیادە دکەن بۆ نموونە کو ئامرازەکە بۆ پێکگوهۆڕینێ و پیڤەرەکە بۆ بهایان و ئامرازەکە بۆ پاشکەوتکرنێ و ڤەگەراندنا پاشئێخستیان مەرجەکێ گرنگ و سەرەکی بوو بۆ سەرهلدانا باوەر پێدانێ ب دەزگەهێن خۆڤە یێن زۆر و جۆرا وجۆر، ئەرك و دەزگەهێن باوەری پێدانێ دگەل وان قوناغێن دیرۆکی ڤە ئێك ل دویڤ ئێکن جڤاکێ مرۆڤایەتییێ تێدا بووریە و گەشەکریە. باوەری پێدان بوو و ڕەگەزەکێ سەرەکی ژ ڕەگەزێن پارەدارکرنا پێدڤی بۆ دامەزراندنان و گەشەپێدانا پرۆژێن جودا جودا.

### پێناسا باوەری پێدانێ:

دەست بەردانە (هێلان) ژ دارابیەکێ نهۆ بۆ دارایەکێ پاشەڕۆژێ بنەمایێ وێ ژی باوەری بیت، ب ڕامانەکا دی باوەری پێدان پێکهاتیە ژ گوهۆڕینا بهایەکێ نهۆ بۆ بهایەکێ هاتیە پاشئێخستن.

بۆ نموونە خودانێ قەری دەمێ برێ پارەی ددەتە قەرداری کو بهایێ وی یێ نهۆ بهێتە گوهۆڕین بۆ ئومێدا هندێ ددەمێ پاشەڕۆژێ دا بهایێ وی یێ پاشئێخستی وی قەری ل وی دەمی وەربگریتەڤە کو ل سەر ڕێکەفتین ئەڤ تێگەهە دبیتن دەربڕینێ ژ باوەری کرنێ بکەت، و ژلایەکێ دژی دەربڕین بیت ل تێگەهێ (قەری) چونکی هەر دو تێگەهـ پەیمانە ب دانێ د پاشەڕۆژێ دا، بەلێ ل سەر ئاستێ چالاکیێن ئابووری مەرەم ژ باوەری پێدانان کۆمکرن و دەستەبەرکرنا وان هۆکارانە یێن کو ل بیاڤێ

چالاكیێن ئابووریێن جۆرا و جۆر پێدڤی بۆ دراڤیَ نهۆیه ئانكو ئەو تشتن ل جهیَ دراڤی بۆ پێكگوهۆرینیَ بكار دهێن.

كریارێن باوەری پێدانیَ ب رێكێن یاساییێن جودا جودا دهێته پیادەكرن، وەكی قەر داشكاندنیَ و پێشینه و فرۆشتنا پاشئێخستی و كریَ. و گرنگترین شمەك كو بابەتی باوەری پێكرنیَ بیت دراڤه، چونكی رێكیَ ب كەسان ددەت بۆ بدەستڤەئینانا گشت شمەك و خزمەتگوزاریێن خۆییێن دی. ئەڤ شێوێ یاسایی كو باوەری كرن گەلەك جاران وەردگریت پێكهاتیه ژ (قەریَ دراڤی) و بنەماییَ سەرەكییَ باوەری پێدانیَ یه هەبوونا باوەرییَ ل ناڤبەرا قەردەری و قەروەرگری دا ئانكو باوەری كرن ب شیانا قەروەرگری ژ دانا مفای و دانا وی قەری ددەمیَ خۆدا دباوەری پێدانیَ دا پێدڤیه دەمەك ل ناڤبەرا پێدان وەرگرتنیَ ئانكو قەر و دانا وی قەری هەبیت.

## ئامرازێن باوەری پێدانیَ ئەڤەنه :

_ كاغەزێن بازرگانی وەكی كۆمپیالان و چەك و قەبالیَ ریَ پێدانیَ. پێكهاتیه ژ وان كاغەزان كو دشیاندایه بگوهۆریت بۆ كریارێن باوەری پێكرنا دەم كورت دهێته بكارئینان.

_ كاغەزێن بنكنۆت.

_ كاغەزێن دارایی _ پشك _ قەباله (سەنەد).

### جۆرێن باوەری پێدانا بانکان ( الأئتمان ):

مەرەم ژ باوەرپێدانێ و ڕۆلێ وێ دژیانا ئابووریدا ل دویف سرۆشت و فەلسەفا سیستەمێ ئابووری کو دناف جڤاکیدا هەیە دهێتە گوهۆڕین. هەر وەسا ئاستێ پێشڤەچوون و پەرەپێدانا ئابووری، لەورا جۆرێن باوەری پێدانێ ل دویف مەرەم و ئەرکێ داخازکرییێ وێ ژ باوەری پێکرنێ د جودانە و ئەڤ پۆلینکرنە هەر چەوا بیت و ب چ شێواز دابەش کربن ئەو نابیت ژێك جودا بکەینە ڤە، وەسا تێبینی دهێتە کرن کو جۆرە تێکەلکرنەك دناڤبەرا ڤان جۆرێن باوەری پێدانان هەبیت. و ل خارێ جۆرێن باوەری پێکرنێ ل دویف مەرەم و ئەو کارێن کو ئەنجام ددەت پۆلین کریە.

### ئێك_ باوەری پێدان ل دویڤ چالاکیا ئابووری:

ئەڤ جۆرێ پۆلین کرنێ ئەڤانا ب خۆڤە دگریت:

#### ١- باوەری پێدانا بازرگانی:

مەرەم ژ ڤێ باوەری پێکرنێ (الأئتمان) ئەوە کو ب شێوێ ڤەر و ئاسانگارییێن بانکی بدەنە مامەلەکریان بۆ ئەنجام دانا کریارێن کڕین و فرۆشتنێ و بازارگیرییێ (التسویق) و ئالوگۆرکرنا بازرگانیا نافخۆ و دەرڤە چ حکومی بیت یان پرۆژەیان یان تاکە کەس بن، ئەڤ جۆرێ باوەری پێکرنێ دکورت ڤەکێشن (دۆم کورتن).

#### ٢- باوەری پێکرنا ب کاربرن ( مەزاختن ):

ئەو باوەری یە کو کەسان بۆ پارەدارکرنا خەرجییێن خۆیێن بکاربرنێ ب دەست دکەفت، ب تایبەتی بۆ پارەدارکرنا شمەکێن ژی درێژ، ئەڤی جۆرێ باوەر پێکرنێ ددەنە خودان جهێن بازرگانی و کۆمەلێن پێشینەیی (سلف) و بکاربرنێ.

### ٣- باوەری پێدانا وەبەرهێنانێ: (الأئتمان الاستثماري)

مەرەم ژ وان قەر و ئاسانكاریانە كو ددەنە پرۆژێن دام و دەزگەهێن بەرهەمئینانێ بۆ پارەدانا وان هەتا پێدڤیێن وەبەرهێنانان پر بكەن، پرانیا دەمی ژی ئەڤ جۆرێ باوەری پێدانێ ددرێژ ڤەكێشن.

### دوو _ باوەری پێدان ل دویڤ ماوەی.

سێ جۆرێن باوەری پێكرنێ ب خۆڤە دگریت.

#### ١- باوەری پێدانا بانكی یا ماوە درێژ (دۆم درێژ):

گەلەك جاران ئەو پرۆژێن پێدڤی ب پارەدانا سەرمایێ خۆیێ چەسپاندی هەی، پێدڤی بڤی جۆرێ باوەریێ دبیت، لەورا ماوێ وێ ژ (٥) سالا زێدەترە و دگەهتە (٢٥) سالا و (٣٠) سالان ژی.

#### ٢- باوەری پێدانا مام ناڤنجی:

ئەڤی جۆرێ باوەری دانێ ددەنە وان پرۆژان یێن كو پێدڤی ب سەرمایەی هەیە بۆ نویكرن و تازەكرنا ئەو تشتێن هەی، هەر وەسا ئەڤ جۆرێ باوەری پێكرنێ بكاربەری ژی ڤەدگریت كو پێشكێشی كەسان دكەت بۆ بدەستڤەئینانا شمەكێن ژی (تەمەن) درێژ، لەورا ماوێ وی ژ سالەكێ زێدەتر و ژ پێنج سالان كێمترە.

#### ٣- باوەری پێدانا ماوە كورت (دۆم كورت):

ئەو جۆرێ باوەری دانێ كو كەسان و پرۆژە بۆ پارەدانا كریارێن خۆیێن جودا جودا ب دەستڤە دئینن و بۆ ماوەكێ كورتە ژ سالەكێ كێمترە (سێ یان شەش یان نەهـ هەیڤا بگرە هەتا دوازدە هەیڤان.

## سێ _ باوەری پێدان ل دویڤ جۆرێ گرنتیکرنێ ( الضمان ):

مەرەم ژ ڤێ باوەری پێکرنێ (الائتمان الممنوح) کو لایەنێن جودا جودا و ب رێیا وان گرنتیان کو ددەنە وان لایەنێن باوەریا خۆ پێ ددەت و ئەڤێ ژی چەند جۆر هەنە:

### ١- باوەری پێدانا کەساتی ( الأئتمان الشخصي ):

ئەو باوەری یە کو ددەنە قەر وەرگران بێ هندێ کو دەستەبەریەکا دهێتە دیتن پێشکێش بکەن، بتنێ پەیمانێ ددەن بۆ دانا وی قەری ددەمێ خۆدا. بانك و لایەنێن قەردار پشتی بڤان پەیمانان دهێتە گرێدان ل رێیا زانینا پلە و جهێن قەرداران دبازاریدا.

### ٢- باوەری پێدانا دهێتە دیتن ( بەرچاڤ ) ( الأئتمان العيني ):

دڤی جۆرێ باوەریێ دا قەردەر دەستەبەریێن جۆرا و جۆر یێن دیتی پێشکێش دکەن ئەگەر بۆ قەرداری نەرەخسا (چێنەبوو) ئەڤا دستوییێ وی دا بدەت، ئەڤجا بانك دێ هەلویستێ خۆ یێ یاسایی بکارئینیت و بۆ وان دەستەبەریان دێ بەت کو ژلایێ قەرداران ڤە هاتینە دان.

## چار: باوەری پێدان ل دویڤ لایەنێ داخوازکەر:

ئەڤ جۆرێ باوەری پێدانێ خۆ دڤانان دا دیار دکەت:

### ١- باوەری پێدانا گشتی.

دبێژنێ ئەو باوەری پێدان کو ددەنە دەولەتێ یان حکومەتێ یان دام و دەزگەهێن دارایێن دەولەتێ.

## باوەری پێدانا تایبەت:

ئەو باوەری یە کو ددەنە کەسان و دەستەکان و کۆمپانییێن تایبەتێن نە حکومی.

## مەرەمێن باوەری پێدانا بانکی:

باوەری پێدانا بانکی ڕۆلەکێ گرنگ هەیە دژیانا ئابووریا هەڤچەرخ دا ئەڤ گرنگییە ژی ددەمەکی دایە کو ڕۆلی دچارەسەرکرنا پێکگوهۆڕینێن بازرگانیا ناڤخۆ و دەرڤەدا دبینیت، پۆختەیا مەرەمێن باوەری پێدانا بانکی ئەڤێن ل خارێنە:

### ١- پارەدانا بەرهەمئینانێ:

دبیت بەرهەم ئینەر باوەری پێدانێ ب دەستڤە بینن درێیا دەرکرنا قەبالان (السندات) و فرۆشتنا وان بۆ پرۆژان و کەسان ئەڤ چەندە ژی هاریکارە بۆ زێدەکرنا قەبارێ پاشکەوتیان ژلایێ وان بکڕێن قەبالان دکڕن بڤێ ژی ئەڤ دام و دەزگەهێن باوەری پێدای ڕۆلێ نیڤەندکار (الوسیط) دبینیت دناڤبەرا پاشکەوتکەران و بەرهەمئینەران ئەڤ نیڤەندکاریە هاریکاریا ب ساناهی کرن و لەزاتیێ و زێدەکرنا قەبارێ وەبەرهێنانێ و بەرهەمی ددەت د ئابووری دا سەرەرای ڤێ ژی بانك ب پێشکێشکرنا قەران ب شێوەکێ ڕاستەوخۆ بۆ وەبەرهێنەران ژ سپاردێ (ودائع) پشکەوت کەران یێن کو ئەڤێ هەی رادبن.

### ٢- پارەدانا ب کاربرن:

مەرەم ژ ئەرکێ پارەدانا ب کاربرنێ ئەوە کو ب کاربەر (المستهلکین) شمەکێ ب کاربرنا نهۆ و ب پارەدانێ پاشی ب دەستکەفت، ئەڤ جۆرێ باوەری پێدانێ

هاریکاره بۆ هندێ کو ب کاربەر (استهلاك) شمەکێ ب کاربرنا وان ب دەست بکەڤت هەر وەسا بۆ چالاکرنا لایەنێ خواستی (حەزێ) ل سەر شمەك و خزمەتگوزاریان و پاشی پشکداربوونا وێ د زێدەبوونا پانتایا بازاری و زێدەکرنا قەبارێ بەرهەمئینان و وەبەرهێنانێ.

## ٣- چارەسەریا پێکگوهۆڕینان:

ئەنجامدانا ئەرکێ چارەسەریا ئالوگۆرکرنێ و گەردەن ئازاکرنێ (ابراء الذمم) ژلایێ باوەری پێدانێڤە، گرنگیا وێ د رێیا پێکهاتیێن خستەروویا دراڤی دا یان برێ ئامرازێن پێدانێ د جڤاکی دا دەردکەڤت. و زێدەبوونا گرنگیا رێژەیی بۆ دراڤێن سپاردی (نقود الودائع) ل سەرجەم پێکهاتیێن خستەروویا باوەری پێدانێ ب شێوەکێ بەرفرەهە بۆ چارەسەرکرنا پێکگوهۆڕینان و بۆچوونێن قەرداران دناڤبەرا لایەنێن جودا جودا دا. و رابوونا بانکێن بازرگانی ب دروستکرنا سپاردان و بکارئینانا ئامرازێن دیێن باوەرپێکری ژ کاغەزێن دارایی و کۆمپیالان هاریکاریەکا زۆر کریە ژ بۆ ساناهی کرنا کریارێن پێکگوهۆڕینێ و بەرفرەهبوونا قەبارێ وێ.

## پرسیارێن پشکا پێنجێ

پ١/ ئەڤان زاراڤان پێناسە بکە: باوەری پێدان    بانکێن بازرگانی.

پ٢/ بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:

١-بەحسێ جۆرێن بانکان بکە.

٢-ئەو پێڤەر چنە بۆ دروستبوونا باوەری پێدانا ژ بانکا بازرگانی؟

٣-ئەو لایەن چنە کۆ بانکێن بازرگانێ پێددەن؟

٤-کۆمەکا بۆچوونا یا بنەماهەنە کۆ بانکێن بازرگانی پەیرەودکەت بۆ دروستکرنا دراڤێ سپاردن. ئەڤ گریمانە چنە؟

٥- بەحسێ وان هۆکاران بکە کۆ قەبارێ سپاردێن پێکهاتی ژ لایێ بانکێن بازرگانی دهێنە دیارکرن.

٦- ج جۆرە پەیوەنیەك هەیە دناڤبەرا باوەری پێدانا نوی (سپاردێن پێکهاتی) و ئامرازێن چەندایەتییێ؟

٧-بەحسێ وان کۆمەلێن بووچونان سەبارەت تێگەهێ بانکێن ناڤەندی هەی بکە.

٨-بەحسێ ئەرکێن بانکێن ناڤەندی بکە.

٩-جۆرێن بانکێن بسپۆری (تایبەتمەند) چنە؟

١٠-ئامرازێن باوەری پێدانێ بژمێرە.

١١-جۆرێن باوەری پێدانا بانکێ چنە؟

١٢-بەحسێ باوەری پێدانێ ل دویڤ چالاکیا ئابووری بکە.

١٣-بەحسێ باوەری پێدانێ ل دویڤ ماوە و دەمان بکە.

١٤- بەحسێ باوەری پێدانێ ل دویڤ جۆرێ گرنتی کرنێ بکە.

١٥-بەحسێ باوەری پێدانێ ل دویڤ لایەنێ داخواز کار بکە.

١٦ مەبەستێن باوەری پێدانا بانکی روهن بکە.

١٧-بەحسێ هزرا دروستکرنا دراڤێ سپاردی بکە.

پ٣/ ئەڤ رستێن ل خارێ دراستن (√) یان خەلەتن (×).

١-شیانێن بانکێ بۆ دروستکرنا سپاردان پشت ب رێژا یەدەکی دهێتە گرێدان.

٢-شيانێن بانكێ بۆ دوو هند جاران (مضاعفة) ژ سپاردێن دروستكری بەروڤاژی دگەل رێژا یەدەكێ لاوەكی.

٣-سەرجەمێ بودجا بانكێن بازرگانی وەكهەڤە ب لێوەرگێرانا (مقلوب) رێژا یەدەكی.

٤- بانكێن ناڤەندی دریێا كومەلەك ژ ئامرازێن چەندایەتی و چاواتییێدا پیادا سیاسەتێن وێ دكەت (الادوات الكمية و النوعية).

## ژێدەرێن پشكا پێنجێ


١- احمد حسين علي الهيتي، اقتصاديات النقود و المصارف، جامعة الموصل، دار ابن الاثير للطباعة و النشر، الموصل، ٢٠٠٥.

٢- جمال خريس و ايمن ابو خضير و عماد خصاونة، النقود و البنوك، الطبعة الاولى، دار المسيرة للنشر و التوزيع و الطباعة، عمان، ٢٠٠٢.

٣- د. عوض فاضل اسماعيل الديليمي، النقود و البنوك، جامعة بغداد، مطابع دار الحكمة للطباعة و النشر، بغداد، ١٩٩٠.

٤- د. محمود يونس و د. عبدالنعيم مبارك، اقتصاديات النقود و الصرفية، مؤسسة شباب الجامعة الاسكندرية، ١٩٨٢.

٥- د. ناظم محمد نوري الشمري، النقود و المصارف، جامعة الموصل، مديرية دار الكتاب للطباعة و النشر، الموصل، ١٩٨٨.

٦- د. صبحي تادرس قريصة، النقود و البنوك، دار الجامعات المصرية، الاسكندرية، ١٩٨٨.

٧- د. عبدالمنعم السيد علي، اقتصادات النقود و المصارف، الجزء الاول، الطبعة الاولى، الجامعة المستنصرية، مطبعة الديواني، بغداد، ١٩٨٦.

٨- د. محمد احمد الرزاز، محاضرات في النقود و البنوك، دار الجمامي للطباعة، القاهرة، ١٩٧٤.

٩- د. كامل البكري، الاقتصاد التجميعي، مؤسسة شباب الجامعة للطباعة و النشر، الاسكندرية ١٩٨٥.

١٠- د. اكلام حداد و مشهور هذلول، النقود و المصارف: مدخل تحليلي و نظري، دار وائل للنشر عمان، ٢٠٠٥.

# پشکا شەشێ

## بێكاری

## UNEMPLOYMENT

بێكاری وەكو دیاردەیەك ل پرانیا جڤاكێن مرۆڤایەتیێ ژ كەڤن وەرە هەتا كو نهو هەبویە و چ جڤاكەكێ مرۆڤی كێم هەتا زۆر بێ ئەڤ دیاردە نە بووینە، ل ولاتێن هەڤچەرخ وەسا دەركەڤت كۆ خولا ئابووریا چالاك بێ دیاردا بێكاریێ رونا دەت، ئەڤ حالەتە ژی ب سەر ئابووریێ ناڤخوو و نەتەوەیی دێ رەنگ ڤەدت ل سەر بوارێن گەشەكرن و ڤەژاندن و پەرەپێدانێ، كو دێبیتە ئەگەرێ دابینكرنا دەلیڤا كارێ جۆراو جۆر و باشتر ژی كێمبوونا رێژا بێكاران د ناڤ جڤاكیدا، بڤی جۆری خۆلا ئابووری رۆلێ سەرەكی د پێكهاتا ئابووریێ جڤاكێن شارستانی و چالاكی و بازارێ كاریدا دبینێت، چونكی بێكاری ب شێوەكێ گشتی د پرانیا دەمادا ب وان گۆرانێن ئابووری یێن دەولەتا ڤە دهێتە گرێدان. دەمێ بێكاری دەردكەڤت كو رێژا وێ دگەل زێدەبوونا رێژا داكێشانا ئابووری، هەڤدەم دگەل رویدانێن قەیرانێن ئابووری یێن دەمی كۆ ب هۆكارێ ناڤخۆیی رویددەت ژ ئەنجامێ كارو كریارا كاری یان خرابیا پەیوەندیێ دناڤبەرا پرۆگرامێن خواندنێ و بازارێ كاری یان ب ئەگەرێ هۆكار و گڤاشتنێن ژ دەرڤەیێن پەیوەندیدار ب سیستەمێ ئابووریێ نیڤ دەولەتی ڤە.

بێكاری ئێك ژ دیارترین گرفتێن ئابووری و كۆمەلایەتی یێن كەسان و حكومەتێ دێتە هژمارتن كو كێشە و گرفتێن جۆراوجۆر ڤێدكەڤیت، ئەڤە ژی ژ ئەنجامێ

وێ كاریگەریا خرابەیا كو ل سەر سیستەمێ ئابووری و سیستەمێ كۆمەلایەتی دروست دكەت، لەورا پرانیا ولاتان ل جیهانا هەڤچەرخ ب بەردەوامی هەولا ڤەكۆلینا ل سەر بێكاریێ و هۆكار و دەرئەنجامێن وێ ل سەر جڤاكان ب دیار دەردئێخن و دگەل سەرجەم ئاكنجیان بەراورد دكەن، و دڤیا هژمارا بێكاران و دۆزا بێكاریێ كو ژ بەر نەبوونا دەلیڤا كارێ گونجای دكەڤیتە سەر وانا چارەسەر بكەن.

بێكاری ژ گرنگترین وان كێشانە كو (سیاسەتمەدار و خۆدان بریار) مژویل كرینە و هەولا دانانا پلان و پرۆگرامێن دارێژتی بۆ كێمكرنا رێژا بێكاران و كێمكرنا وان دناڤ جڤاكیدا، ئەڤ گرنگی دانا زۆر ژی ل وی بیاڤی دهێت كو دیاردا بێكاریێ كو ب خۆ یا گرنگە و شوونوارێن مەزن ڤێدكەڤن ب تایبەتی ل سەر ژێرخانا كۆمەلایەتی.

بۆ گەهشتنا تێگەهەكێ هویر بۆ بێكاریێ وەسا پێدڤی یە ئاماژە بڤان دەستەواژێن ل خارێ بكەین، هاریكاریا مە بكەت بۆ دارشتنا پێناسەكا روهن و ئاشكرا یا بێكاریێ:

## كار: Labour

كار ژ بنەمایێن گرنگێن بەرهەمئینانێ نە (رەنگە ژ هەمیان گرنگتر بیت) ئەو داهاتێ ژ ئەنجامێ كاری دەست دكەڤت پشكا هەرە مەزن داهاتێ نەتەوەیی پێك دئینت، كار پێكهاتیە ژ خستنە روویا دەرامەتێن مرۆڤی ژ هەردوو بوارێن جەستەیی و (Physicel) و هزری (mental) ئەڤ خستنەروویە ژی پشت ب دو هۆكاران (فاكتەران) دهێتە گرێدان كو ئەڤەنە.

١- هیزا كارێ كۆمەلایەتی یا بەردەست، ب رامانا ئاكنجیان ژ بلی وان تەخ و گروپان كو كار ناكەت.

٢-هژمارا دەمژمێرێن كارێ هەفتیانە كو ئاكنجی د بەرهەڤن ئەنجام بدەن.

كار ب وێ دهێتە پێناسەكرن، (كو شیانەكا جەستەیی و هزرییە كۆ مرۆڤ ئەنجام ددەت ل بوارێ چالاكیێن ئابووری و پیشەیی ژ پێخەمەتی ب دەستڤەئینانا دەسكەفتەكی ئانكو ب دەستڤەئینانا خەلاتەكی).

كۆمەكا هۆكارێن جۆراوجۆر هەنە كو كاریگەری ل سەر شیانا كاری هەیە ژوانا:

١-ساخلەمیا گشتی یا هێزا كاری.

٢-روشەنبیریا گشتی و ئەو پێشینەیا (الخلفية) زانیاری كۆ هێزا كاری هەی.

٣-ئەو خەلاتێن ل برامبەر كاری دهێنە پێشكێش كرن.

٤-مەشق كرن.

## هێزا كاری: Manpower

ئەو هێزە كۆ مرۆڤی بۆ كاری هەی، كو پێكهاتیە ژ كۆمەكا شیانێن مادی و هزریێن ڤەشارتی دلەشێ مرۆڤیدا و ژ كەسایەتیا وی یا زیندی، كو ب رێیا وێ دشێت شیانێن مادی (شمەك و كارگوزاری) بەرهەم بینت.

هێزا كاری دامەزرێنەر و لڤینا بنەمایێن بەرهەمینانێ نە، دگەل پێشكەفتنا هۆكارێن بەرهەمینانێ ل دەڤ مرۆڤی شیانێن زێدەتر بۆ كاركرنێ دروست دبیت، كار شیانا مرۆڤی یە بۆ هندێ دا ببتە ژێدەرەك

بۆ ب دەستڤەئینانا ژیارێ و دابینکرنا پێدڤییان و د ئەنجامدا پشکداریکرن ژ دروستکرنا خۆش ژ یاریا گشتی بۆ جڤاکی.

بەلێ هێزا کارکەری (labor force) وان کەسان ڤەدگریت کو شیانێن کارکرنێ هەنە و ب کارێ بەرهەمئینی رادبن و ژ برێ ڤی کاری ژی کریەکا نەختینەیی یان زیندەمالی وەردگرن. ئەڤ حالەتە وان بێکاران ژی ڤەدگریت کو (حەز و ئارەزوویا کاری هەیە، بەلێ ب دەست ناکەڤت).

ب دەستەواژەکا دی رێژەکا دیارکریە ژ سەرجەمێ ئاکنجیان کو هێزا کاری دناڤ جڤاکیدا پێك دئینن (سەرجەم ئەو هێزە کو ل هەر قۆناغەکا سەردەمدا دئێخنە بەرچاڤ) ئانکو ئەو پشکا ئاکنجییانە کو شیان و حەز و ئارەزوویا کارکرنێ هەیە.

## کارپێدانا (بکارئینان) تمام: Full Employment

ئەو حالەتە کۆ تێدا ئابووریێ نەتەوەیی دگەهتە شیانا ب کارئێخستنا سەرجەم تاکە کەسێن هێزا کارکرنێ کو ل دویڤ کاری دا دگەریێن و شیانێن کاری هەنە بوی نرخێ ئاسایی پەیرەوکریە هەڤدەم دگەل کارپێدانا تمام بێکاریەکا لاوەکی پەیدا دبیت، چونکی کارپێدانا تمام ب شێوەکێ کێم ل هەمی سیستەمێن ئابووریێن جۆراو جۆر بەرچاڤ دکەڤت، ل دویڤ وێ کارپێدانا تمام پێکهاتیە: (ژ وی ئاستێ کو ب کارئینان داویێ ب بارودۆخێ بێکاریا زورە ملی (ب خورتی) دهینت، ئەڤ ئاستە ژی د ئێکەم جاردا وەکو وێ یە کو:

(رێژەکا دیارکری ژ کارکرنێ کۆ دشیاندایە دگەل دەم ژمێرێ کارکرنێ بهژمیریت ئەگەر پێزانینێن تمام و تایبەت ب خستنەروو و خواستی (حەز) و بازارێ کارکرنێ هەبوون).

## **بێکاری:** unemployment

دیاردەکە د وێرێدا دەردکەڤت ئەو کەسێن کو د ژیێ کارکرنێدا نەشێن پشکداریێ دچالاکیا ئابووریدا بکەن د دەم و وەختەکێ دیارکری دا ژ ئەنجامێ هۆکارێن ژ دەرڤەی حەز و خواستێن وان، هەر چەندە شیانێن کارکرنێ و حەزا ب دەستڤەئینانا کاری هەیە و ب بەردەوامی ل دویڤ دگەریێن.

ب شێوەکێ گشتی بێکاری نیشانەکە بۆ هەبوونا جوداهیێ دناڤبەرا برێ خستنەروویا کاری و برێ کاری ب کارئینای، ل ناڤ چالاکێن ئابووری ژ ئاستێ رێژا کرێ و بارودۆخێ ئەو کارێ دبازاریدا هەی و تێکرایێ بێکارێ ژی یێ جودایە دناڤبەرا پیشە و چالاکێن ئابووریێن جۆراو جۆردا و هەروەسا دناڤبەرا دەڤەرێن جوگرافی و تەخان و ژیێن جودا دا.

**تێکرایێ بێکاریێ ژی:** کو ب نیشانەکا ئابووری یا سەرەکی دهێتە دانان بۆ شیانێن ئابووری، ئەو ئابووریێ کو تووشی بێکاریا بلند و بەردەوام بووی تووشی ب فیرۆ چوونا (ب هەروە) دەرامەتێن بەرهەمئینانێ دبیت، ل سەر ڤی بنەمای ئاکنجی ل دویڤ ئاماران دابەش دبن ب سەر چار کۆمەلان (گروپا):

١- ئەو کەسێن کو دناڤ هندەك جۆرێن کاریدا هاتینە دامەزراندن ل دەمێ ئەنجامدانا سەرژمێریێ.

٢-ئەو کەسێن داخوازا کاری دکەن، بەلێ ل دویڤ ناگەریێن چونکی وەسا دزانن کار ب دەست ناکەڤت.

٣-ئەو کەسێن داخوازا کاری دکەن و ب دیڤدا دگەردێن بەلێ ئەو کار ب دەست ناکەڤت کو یێ داخوازدکەن.

٤-ئەو کەسێن دەرڤەی هێزا کاری و داخوازا کاری ژی ناکەن.

دەمێ بێکاری ژی ب تێکرایا بێکاریێ دهێتە پیڤان، پێکهاتیە ژ ژمارا ئەو کەسێن کار نەکەن ل سەر سەرجەمێ هێزا کاری وەك بڤی شێوێ خارێ هاتیە روونکرن:

$$\text{تێکرایا بێکاریێ} = \frac{\text{هژمارا بێکاران}}{\text{سەرجەمێ هێزا کاری}} \times ١٠٠$$

## هۆکارێن بێکاریێ: The causes of unmploy ment

دشێن هۆکارێن بێکاریێ بۆ ڤان ئەگەرین ل خارێ ڤەگەرینین:

### ئێك : هۆکارێن ناڤخۆیی :

بێکاری د ئابووریێ هەر ولاتەکیدا هەبت دکەڤیتە بن کاریگەریا ڤان هۆکاران ئەڤجا چ لایەنێ خواستی (حەز) بیت یان لایەنێ خستنە روو (العرض):

١-بلندبوونا رێژا گەشەکرنا ئاکنجیان ب تایبەتی ل ولاتێن تازە پێگەهشتی.

٢-زێدەبوونا دەرچوویان ل بوارێ خواندنێ ژ سەرجەم پسپورایەتیێن زانستی.

٣- هاتنا کرێکارێن ژ دەرڤە چ کرێکارێن هاتی بن یان کرێکارێن کوچبەر یان ئەو کرێکارێن کو ل ناڤخۆدا مشەخت دکەن ژ ئەنجامێ هۆکارێن (ئابووری ، رامیاری، کۆمەلایەتی... هتد)

٤- بێ شیانیا ئابووریێ ناڤخۆ ژ پێك ئینانا کەلەکبوونا (کەفتنە سەر ئێك) سەرمایەیێ پێدڤی بۆ وەربەرهێنانێ ژ پرۆژێن ئابووریێن جۆراوجۆرێن ناڤخۆ ژ سەرجەم بوار بوارێن (ئاڤەدانکرن و بەرفرەهکرن و پێشئێخستن)

## دوو: هۆکارێن دەرڤەیێن بێکاریێ پێکهاتینە ژ:

١-بارودۆخێ ئابووریێ جیهانی کو تووشی گوهۆرینێن ئابووری جاروباران دبیت ب تایبەتی راوەستان و داکشانا ئابووری، ب تایبەتی ئابووریێ ولاتێن پێشکەفتی، کو رۆلێ و کاریگەریەکا مەزن ل سەر ئابووریێ ولاتێن دی هەیە.

٢- کاریگەریا رویدان و کارەساتێن جیهانی کو ل سەرجەم ئابوورێن جۆرا و جۆر رویددەت و دبیتە ئەگەرێ لێکدان و تەنگەزاریێن ئابووریێ جیهانی و کارتێکرنێ ل سەر زێدەبوونا رێژا بێکاریێ و بلنبوونا نرخێ نەختی (نەقدی) و ژێدەرێن دیێن وزەیێ دکەت، ئەڤە ژی دبیتە ئەگەرێ بلنبوونا تێچوونا بەرهەمی و کێمبوونا ب کارئینانا وان.

## جورێن بێکاریێ: Types of Unempioyment

بێکاری چەندین جۆرا ب خۆڤە دگرت ئەڤە ژی ژبەر هۆکارێن وێ، ئەڤە ژی وە دکەت ب چەندین پێ رابوونا رابت بۆ رویبریبوونا وێ. دبیت جوداهیێ دناڤبەرا دوو جۆرێن سەرەکی یێن بێکاریێ دا بکەین، ل ناڤ هەر ئێکێ ژ وان چەند جوداهیێن دی هەنە ئەو ژی:

ئێك: بێكاريا ئاشكرا (ديار) كو دابەشی دبيت بۆ:

(١) بێكاريا زوره ملی (ب خورتی) وەك بێكاريا نه گونجای (ب ئێكەفتن) و پەيكەر بەندی و جار و باران وەرزی.

(٢) بێكاريا ئارەزوومەندانه.

دوو: بێكاريا ڤەشارتی (نەديار)

و لخارێ ب هويری دێ ل سەر ئاخڤين:

### ١- بێكاريا زۆره ملی ( ب خورتی ): كو چوار جۆرن:

### أ- بێكاريا نەگونجای ( ب ئێككەفتن ): ( الاحتكاكية )

ئانكو ئەو كەسێن شيانێن كاركرنێ هەين لەورا ل دويڤ كارەكێ گونجای يان باشتر دگەريێن ئەڤە ژی د دەمەكيدايه كو كارەكێ وەسا هەيه كو دگەل شيان و شارەزايی و ژيیێ وان دگونجيت، كو چ ئەو كار ب دەست نەكەفتينه، ژ بەر هندێ كو نەدزانی ئەڤ كاره هەنه و ل كيرێ هەنه ل هەمان دەم ژيدا خودان كار ژی هەول ددەن بۆ ڤەديتنا كرێكارێن دی بۆ هندێ دا جهێ وان كرێكاران بۆ بگرن كو نێزيكه ژيیێ وان ب سەرڤه بچيت. و خانەنشين بن يان ژبەر بەرفرەهبوونا دەزگەه و كارگەهێن وان پێدڤی ب كرێكارێن دی هەنه.

### ب- بێكاريا پەيكەر بەندی ( ژێرخانه ):

پشكەك ژ وان كرێكارێن نه شارەزا و نه بەهرەمەند ڤه دگەريت كو نەشێن كاربكەن ل پيشەسازيێ و چاندنا تاره و پێشكەفتی ژبەر پێشكەفتنا شێوازێن بەرهەم ئينانێ و نه راهێنانا ڤان كرێكاران، ئانكو نه گونجايا شيانێن وان كرێكاران دگەل پێدڤی يێن وی بازارێ كاری ئەڤ جۆره بێكاريه گەلەك

ڤەدکێشت بۆ کرێکاری هەتا خۆ را بهینت (فێربکەت) ل سەر وان پێشکەفتنێن بسەر وان بوارا دا هاتین.

هەر دناڤ ڤی جۆرێ بێکاریێ دا وان دەرچوویان ڤە دگرت کۆ هژمارا وان گەلەك زێدەترە ژ پێدڤی بوان پسپوران وەك هژمارا زۆرا دەرچوویان (ژ ئەندازیاران، پزیشکان، مامۆستایان، ژمێریاران) کو گەلەك زێدەترە ژ پێدڤی یا بازاری ئانکو پەیکەر بەندی و ژێر خانا ئابووری نەشێن ئەڤێ هژمارا زۆر ب خۆڤە بگرن.

ئەڤ جۆرە بێکاریە زێدەتر ژ ولاتێن تازە پێگەهشتی بەرچاڤ دکەڤیت، چونکی زیادەکا زۆرا دەستێ کارێ نە شارەزا و هونەری پەیدا بوویە کو دگەل پێدڤی یێن بازاری ناگونجین، ئەڤ جۆرە بیکاریە ژ ئەنجامێ نەبوونا بنەمایێن دیێن بەرهەمئینانێ دروست دبت کو بو پرۆسا بەرهەمئینانێ یا پێدڤی یە.

**دوو رەهەندێن جودا هەنە ل سەر ڤی جۆرێ بێکاریێ:**

١-نەگونجایی دناڤبەرا شیانێن بێکاران و ئەو شارەزاییا هەی دگەل وان پێدڤی یێن کو دلیڤا کاری دڤێت.

٢-نە گونجایی دناڤبەرا ئەو جهێن کارتێدا هەی و ئەو جهێن بێکار ژی دڤێت کاری لیبکەت.

## ج- بێکاریا جاروباران: Cyclical Unemployment

بێکاریا جارو باران ب بێکاریەکا زۆرە ملی (خورتی) دهێتە دانان و یا گرێدایە ب هەلکشان و داکشانا چالاکیا ئابووری ڤە کو ب گوهۆرینان دهێتە ناڤکرن (Trade Cycle) کۆل دەمێ راوەستان و داکشانێ دەر دکەڤیت، چونکی خواستێ هەمووکی

ل سەر شمەك و خزمەتگوزاریان كێم دبیتەڤە، خودان كار رادبن ب دەست بەردانا پشكەك ژ كرێكاران، ئابوورناس و بەرپرسێن دەسەلاتدار گرنگییەكا زۆر بڤی جۆرێ بێكاریێ ددەن. ئەڤە ژی ژ ئەنجامێ وێ مەترسیا زورە كو ڤێدكەڤت. هەولێ ژی ددەن ئاستێ بەرهەمئینانێ دانە بەزیتە خارێ، هەڤدەم هەولا ب دەستڤەئینانا ئاستەنگێ گونجای ددەت ل چالاكیێن ئابووری دا، كو وەدكەت ئەڤ جۆرە بێكاریە دەرنەكەڤت و كاریگەریێن ویێن خراب كێمتر بیت.

هندی ئابوورێ و لاتێن تازە پێگەهشتی زێدەتر پێش بكەڤیت و پەیكەر بەندیا ئابووری هەمە جۆر بیت، دێ كاریگەریا گوهۆرینا وێ كێمتر بیت ل سەر ئابووریێن دیتر و ب بەروڤاژیڤە راستە.

### د- بێكاریا وەرزی: Seasonal Unemploy Mdnt

ژ ئەنجامێ كێمبوونا خواستی (حەزێ) ل سەر كرێكاران رویددەت، ب رامانەكا دی زێدەبوونا خستە روویا كاری د وەرزەكێ دیاركریدا. دبیت وەرزێن سالێ یان وەرزەكێ دی. كو وەبكەت دەمەكێ دیاركری د وێ سالێدا بێكاری زور بیت، بۆ نموونە د زڤستانێدا كرێكارێن خاانی ئاڤاكرنێ یان د زڤستانێدا كارمەندێن بوارێ گەشت و گوزاری بێكار دمینەڤە كو چ ل وەرزەكی كو ئاڤو هەوا (سەقا) یێ گونجاێ بیت ئانكو كەشوهەوایەكێ دیاركری و گونجای یان هەلكەفتەكا ئایینی بیت، ئەو دەمێن گەشتیار نەبن كارێ وان ژ دەست دچیت ئەڤ جۆرێ بێكاریێ دولاتێن تازە پێگەهشتیدا زێدەتر بەلاڤ دبیت كو چرپا ئاكنجیان زورە و ب رێژەكا مەزن پشت ب چالاكیا چاندنێ دهێنە

گرێدان، چونکی پێدڤی ب برەکا کێم یا سەرمایە و ئاستەکێ کێم یێ شارەزاییێ و تەکنیکی هەیە، زێدەبوونا کارمەندو و کرێکار دڤی کەرتیدا دێبیتە ئەگەرێ زێدەبوونا داخوازییێ ل سەر کرێکاران دوەرزێن چاندنێدا یان دورینێ و دناڤبەرا وا دو ماوا ژی دا پشکەکا زۆرا کرێکارا بێکار دبن.

**٢- بێکاریا ئارەزوو مەندانە : Voluntery Unemployment**

ئەڤ جۆرە بێکاریە وان کەسان ڤەدگرت کو شیانێن کاری یێن هەین، بەلێ ژبەر نزمیا کریا وان بەرهەڤ نینن دوان بوارادا کار بکەن، بۆ نموونە ئەو کەسێن داخوازا کریەکا زور دکەن یان هندەك ژ فرۆشیارێن گەرۆك پارێ کێم وەرناگرن یان ئەو کەسێن بەری هینگێ کارەك کری و مووچێ وان زێدەتر بوویە ژ وی کارێ کو نهو و ب دەست کەڤیت، ئەڤ جۆرێ بێکارییێ ژی ناچیتە د چارچوڤێ (هێزا کاری دناڤ جڤاکیدا).

**دوو: بێکاریا ڤەشارتی ( نەدیارژێر پەردە ) Disguised Unemploy Ment**

دبێژنێ ڤەشارتی یان ژێر پەردە چونکی نە دیارە، وان کرێکاران ڤە دگرت کو د ئاستەکێ نزمێ بەرهەمئینانێ کاردکەن، بگر ب رادەکی ئاستێ بەرهەمئینانا وان (سفر)ە، ئانکو کرێکار ب کێمتر ژ شیانا بەرهەمئینانا خۆ کاردکەن. گەلەك جارا ژی هژمارەکا زۆر ژ کرێکاران دکەرتەکیدا کاردکەن بێ کۆ رێژەکا زێدە بێخنە سەر وی بەرهەمی ل وی کەرتیدا، خودان بەرهەکێ راستەقینەیی نینن، سەرجەمێ بەرهەمئینانا وان سفرە و پرانیا جارا ژی سالبە، دوو تێگەە بۆ ڤی جۆرێ بێکارییێ هەنە:

١) ئەوان كەسان ڤەدگریت یێن کو کار دکەن، بەلێ نە ب هەمی شیانێن وان ڤە، یان دبوارێ وەسا دا کاردکەن کۆ رێژا بەرهەمئینانا وان گەلەك کێمترە ب بەراورد ب کارێن دی.

٢) ئەوان کەسان ڤەدگریت یێن کو ل وان کاران دا کاردکەن کو رێژا بەرهەمئینانا سنووورداری (الانتاجیه الحدیه) گەلەك یا کێمە یان هەر نینە یان سالبە ئەڤ بۆچوونە ژی زێدەتر یا بەربەلاڤە.

ئەڤ جۆرێ بێکاریێ زێدەتر ل بوارێن چاندنا سەرەتایی یان کارێن کەرتێ گشتی یێ حکومەتێ ب دیار دەردکەڤیت، ئانکو هژمارا کرێکاران ل یەکەیەکا بەرهەمئینانێ گەلەك زێدەترە ژ وێ هژمارا کۆ پێدڤی پێ، ئانکو دو کرێکار دشێن زەڤیەکێ ب رێڤە ببن بەلێ پێنج کرێکار کاری تێدا دکەن، ئەڤ شێوازە ژی ل چاندنا سەرەتایی یا روهن و دیارە بۆ نموونە خێزانەکا (دەهـ) کەسی کو چار ژ وانا شیانێن کاری یێن هەین د زەڤیەکیدا و ل ماوەکێ دیارکری ل سالێ کاردکەن، دەمێ کارکرنا وان دهێتە هژمارتن بۆ مە دەردکەڤیت کۆ ئەگەر ب تنێ ئێك کرێکار رۆژێ هەشت دەمژمێران کاربکەت ئەوی زێدەتر ژ سەرجەمێ دەمێن وان هەر چار کەسان کارکریە. هەڤدەم فەرمانگەهەکا حکومەتێ کۆ پێنج فەرمانبەر تێدا کاردکەن، ئەگەر بێت و دەمژمێرێن وان رۆژانە حساب بکەین بۆ نموونە شازدە دەمژمێر دێ دەرکەڤن، کو ئانکو ب هژماردنا دەمێن کاری کو هەشت دەمژمێرن د رۆژەکێدا هوسا بۆ مە دەردکەڤیت کو دناڤ وێ فەرمانگەهێ دا سێ کەس د زێدە نە کو دچنە دناڤ قالبێ بێکاریا ڤەشارتی دا، بەلێ نزانن ئەو هەر سێ فەرمانبەرێن بێکار کینە، چونکی هەر پێنج فەرمانبەر ب کار کەر دهێنە هژمارتن.

ئەڤ جۆرێ بێکاریێ زێدەتر ل ولاتێن تازە پێگەهشتی سەرهلدایە و بەلاڤبوویە، ئەڤە د دەمەکیدایە کو دەلیڤا کارکرنا سنووردار یا کێمە، ب تایبەتێ ل بوارێن بەرهەمئینانێ، ئەڤە ژی وە دکەت کو کەس ل هەمی کاران دا کاربکەت هەتا ئەگەر ژ ئاستەنکێ نزم ژی دا بیت و بەرهەمێ وی ژی یێ کێم بیت، ئەوا کو بارودۆخێ وی ئالۆزترکریە، نزمیا ئاستێ فێرکرن و بلندبوونا رێژا دەستێ کاری یا نە شەرەزایە.

## شوونوارێن بێکاریێ:

پرانیا ئابوورناسان ل دەمێ ڤەکۆلینێ ل سەر بێکاریێ دکەن دا کوکیێ ل سەر شوونوارێن ویێن ئابووری دکەن و شوونوارێ بێکاریێ ڕەهەندێن ئابووری دبۆرینت و لایەنێ کۆمەلایەتی و دەروونی ژی ڤە دگریت، لەورا زێدەتر دێ بەحسێ هەرسێ شوونوارێن (ڕەهەند) بێکاریێ کەین:

### ئێك: شوونوارێن ئابووری:

کار رەگەزەکێ بەرهەمئینانێ یە و هەر کێم و کورتیەك ل سەر ڤی رەگەزی روویبدەت ئانکو ژ دەستدانا بەرهەمئینانێ یە ل ناڤ جڤاکی، چونکی پشکداریێ د پروسا بەرهەمئینانێدا ناکەت، ژ لایەکێ دیڤە کرێکارێ دەست بەتال شیانێن ب دەستڤەئینانا داهاتی نینن، ئانکو شیانا وی بۆ کرینێ یا کێمە یان هەر نینە و ئەڤێ ژی کاریگەری ل سەر قەبارێ خەرجییێن گشتی هەنە، ئەڤە ژی وە دکەت ئاستێ خواستێ (حەزا) گشتی دا بەزیت، کێمبوونا حەزا گشتی خرابی ل سەر دا کشانا ئابوورێ نیشتمانی هەیە، چونکی حەز پالدەرێ بەرهەمئینانێ یە، کێمبوونا حەزێ دبیتە ئەگەری نزمبوونا بەرهەمئینانێ ژی، کو د داوییێدا بێکاریێ ئالۆزتر و بەرفرهەتر لێ دکەت.

بڤی شێوێ شوونوارێن ئابووری ل سەر بێكاران یێ راستەوخۆیە و نە باشە (سلبية)، چونكی دبیتە ئەگەرێ نزمبوونا داهاتێ وان یان ددگەهتە سەر سفرێ، د ڤی حالەتیدا بێكار پەنایێ دبن بۆ خەرجكرنا وی پارەێ كو بەری هینگێ پاشكەوتی كریە، نزمبوونا داهاتێ تاكە كەسی یان نەبوونا داهاتێ دبیتە ئەگەرێ كێمبوونا ئاستێ خەرجییان، د ئەنجامدا كارتێكرنێ دكەتە سەر ساخلەمیا كەسان و رێژا بەرهەمئینانا وان كێم دبیت.

شوونوارێن ئابووری یێن بێكارییێ بتنێ كارتێكرنێ ل سەر بێكاران ناكەت، بەلكو كارتێكرنێ ل سەر ئابوورێ ولاتی ژی دكەت، چونكی ل دەمێ راوەستان و داكشانا ئابووری، ئانكو هەبوونا بێكارییێ و راوەستانا لڤین و چالاكیێن بەرهەمئینانێ و كرین و فرۆشتنێ، وەدكەت تێكرایێ وە بەرهێنانێ نزم ببیت، كو ب زڤرینەرێ (لەولەبێ) (محرك) سەرەكی یێ چالاكیا ئابووری دهێتە دانان، لڤێرێدا دبیت شوونوارێن خراپ یێن بێكارییێ كو مبكینەڤە كو د دەرئەنجامدا تێكرایێ وەراربوونا سەرجەمێ بەرهەمێ ناڤخۆیێ و پەرەپێدانا ئابووری نزم دبیت.

## دوو : شوونوارێن کۆمەلایەتی ( جڤاکی ) و دەروونی :

بێکاریێ کاریگەریەکا خراپ ل سەر باریێ دەروونی و کۆمەلایەتی (جڤاکی) یا کەسێ بێکار هەیە، هەستکرن ب بێ ئومیدیێ باوەری ب خۆ نەبوون یا بەندبوونا وی (ئینتامبوون) بۆ ژیانێ لاواز دکەت، ئەڤ هەستە زێدەتر دبیت هندی ماوێ بیکاریێ زێدەتر بیت، و کاریگەریا ڤی هەستی ژی ل سەر جڤاکێ بێکار کاریگەریەکا کاڤلکارە، ب تایبەتی بابەتێ ئینتمائێ کۆ هۆکارەکێ بنەرەتی یە د پروسا پەرە پێدانا سەرتا سەری دا، کەساتیا بێکاری هەست ب وێ دکەت کو مافێ وییە کاری ب دەست خۆڤە بینت و دەلیڤەکا باشتر، زۆر زەحمەتە رازی بکەن ل سەر هەڤکاریێ و هەما هەنگینێ دگەل پرۆگرامێن پەرە پێدانێ ل نافخۆیا ولاتێدا، گەلەك جاران ژی شوونوارێن دەروونی و کۆمەلایەتی یێن بێکاریێ دبنە ئەگەرێ زێدەبوونا رێژا بێکاران و تاوانان و زێدەبوونا هەلوەشاندنا خێزانێ.

دشێن شوونوارێن کۆمەلایەتی یێن بێکاریێ د ڤان خالێن خارێدا پۆختە بکەین:

١- هەستکرن بێ ئومیدی ڤالاهیێ و بێزاریێ دێبیتە ئەگەرێ لادانا ڕەوشتێ کەسان دناڤ خێزانێ و جڤاکیدا.

٢-هەستکرن ب بەرزەبوونا خۆ کرن (النقمة) دێبیتە ئەگەرێ دزیێ و تاوانێ و هەلوەشاندنا خێزانێ.

٣-دل نەرەحەتی و نە ئارامی دناڤ جڤاکیدا ژبەر بەلاڤبوونا دیاردا تاوانێ.

٤-شێلیا بارودۆخی دێبیتە ئەگەرێ جێگرنەبوونا رامیاریا دولەتێ و گوهۆرینا حکوومەتان دێ ل دیڤدا هێت.

## پسیارێن پشکا شەشێ

پ١: بەرسڤا راست بۆ ڤان خالێن خارێ هەلبژێرە:

١- ئەو بێکاریا ژ ئەنجامێ گوهۆرینان ل جۆرێ پێدڤی و شیانێن کرێکاران پەیدادبیت دبێژنێ:

أ-بێکاریا پەیکەری.

ب-بێکاریا جارو باران.

ج-بێکاریا ڤەشارتی.

د-بێکاریا نەگونجای (احتکاکیة).

٢-ئەو بێکاریا ژ ئەنجامێ زەعێ بوونا دەمێ بێکاران بۆ لێگەریانا کارەکی کو دگەل شیانێن وان دا بگونجیت دبێژنێ:

أ-بێکاریا پەیکەربەندی.

ب-بێکاریا جارو باران.

ج-بێکاریا ڤەشارتی.

د-بێکاریا وەرزی.

٣-ئابوورێ گوهۆری ب بەردەوام:

أ-تووشی بێکاریا ب ئێککەفتن و پەیکەری دبیت.

ب-بتنێ تووشی بێکاریا جاروباران دبیت.

ج-نەمانا بێکاریێ.

د-بێکاریا ڤەشارتی نینە.

٤-زێدەبوونا دەمێ لێ گەریانا نموونەیی بۆ کاری:

أ-رێژا بێکاریێ کێم دکەت.

ب-رێژا بێکاریێ زێدە دکەت.

ج-نرخێ خستنەرووی کێم دکەت.

د-نرخێ خستنەرووی زێدە دکەت.

٥-تێکراییێ ب کارخستنێ (دانە کاری) (التشغیل) وکهەڤە:

١-هژمارا ئەو کەسێن کاردکەن دابەشکرینە ب سەر هژمارا بێکاران.

ب-هژمارا کەسێن بێکارا دابەشکرینە ل سەر هژمارا ئاکنجییێن مەدەنی.
ج-هژمارا کەسێن کارکەر کو دابەشکرینە ل سەر هێزا کارکرنا مەدەنی.
د- هژمارا ئەو کەسێن کاردکەن دابەشکرینە ل سەر هژمارا ئاکنجییێن مەدەنی.

پ۲: ئەڤ دەستەواژێن ل خارێ ب راست ($\sqrt{}$) یان خەلەت ($\times$) بەرسڤ بدە:

١- پرانیا کێشێن کۆمەلایەتی و تاوانێن رۆژانە ئەگەرێن وێ بۆ هەبوونا کێشا بێکاریێ دزڤریت.

٢-رێژا بێکاریێ بڤی شێوەی دهێتە پیڤان:

٣- بێکاریا پەیکەری، ژ ئەنجامێ زێدەیا هێزا کاری نەیا هونەری پەیدادبیت، کو نابیت ل کەرتێ چاندنێ و پیشەسازیێ ب کاربهینن، چونکی ئەو هەر دوو کەرت پێدڤی ب شیانەکێ هەنە بگونجیت دگەل شێوازێ نویێ بەرهەمینانێ.

٤- نیڤ بێکاری (شبه البطالة) بڤی ناڤی ناڤکریە، چونکی بێکاریەکا تمامەد دناڤ جڤاکیدا.

پ[٣]: پێناسا ڤان تێگەهێن خارێ بکە:

بێکاریا نەگونجای (الاحتكاكية) - بێکاریا ڤەشارتی -گەریان ل دویڤ کاری کار -هێزا کاری -کار پێدانا تەمام.

پ[٤]: تێگەهێ بێکاریێ روهن بکە، چەوا تێکرایێ بێکاریێ دهێتە پیڤان؟

پ[٥]: بێکاریێ هۆکارێن ناڤخۆیی هەنە، وان هۆکاران دیاربکە و روهن ژی بکە؟

پ[٦]: گەلەك جۆرێن بێکاریێ هەنە کو ل بارودوخی بۆ بارودوخەکی دی د جودانە و ژ دەولەتەکێ بۆ دەولەتەکا دی دهێتە گوهۆرین، ب شێوەکێ درێژ جۆرێن بێکاریێ روهن بکە.

پ[٧]: گرنگترین وان پێ رابوونان بژمێرە یێن کو بۆ نەهێلانا دیاردا بێکاریێ ب کاردهێت.

پ[٨]: بەرسڤا ڤان پسیاران بدە:

١-بێكارى كار دكەتە سەر خوشژیاریا ئابوورى پتر ژ خستەروویا بازارى بتنێ د بازارێ كاریدا نەبت؟

٢-گرنكترین ئەو هۆكار چنە كو كارتێكرنێ ل شیانا كاركرنێ دكەت؟

٣-بەحسێ دەستەیا ئاكنجیان بكە بۆ كاركرنێ.

٤-وان بۆ چووانان روهن بكە یێن كو دەربارەێ بێكاریا ڤەشارتى هەین.

٥-بەحسێ كاریگەریا بێكاریێ بكە.

٦-رولێ رامیارى یێ دارایى و نەختینەیى (نەقدى) د چارەسەركرنا بێكاریێ دا بژمێرە.

٧-كاریگەریێن كۆمەلایەتى یێن بێكاریێ روهن بكە.

پ[٩]: د ڤى خشتێ خوارێدا هژمارا كرێكاران و هژمارا بێكارێن ولاتەكى دیاردكەت.

داخوازى (المطلوب): تێكرایێ بێكاریێ بینەدەرڤە:

| سالۆ | هژمارا ئاكنجیان | هژمارا كرێكاران | هژمارا بێكاران | تێكرایێ بێكارێ ٪ |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٩٨ | ٢ ٠٠٠ ٠٠٠ | ٥٠٠ ٠٠٠ | ٧٥ ٠٠٠ | |
| ١٩٩٩ | ٢ ٥٠٠ ٠٠٠ | ٨٠٠ ٠٠٠ | ١٠٠ ٠٠٠ | |
| ٢٠٠٠ | ٣ ١٥٠ ٠٠٠ | ١ ٠٠٠ ٠٠٠ | ١٥٠ ٠٠٠ | |
| ٢٠٠١ | ٣ ٨٥٠ ٠٠٠ | ١ ٣٠٠ ٠٠٠ | ٢٠٠ ٠٠٠ | |
| ٢٠٠٢ | ٤ ٣٥٠ ٠٠٠ | ١ ٦٠٠ ٠٠٠ | ٢٧٥ ٠٠٠ | |
| ٢٠٠٣ | ٥ ٠٠٠ ٠٠٠ | ١ ٩٥٠ ٠٠٠ | ٣٢٥ ٠٠٠ | |
| ٢٠٠٤ | ٥ ٦٠٠ ٠٠٠ | ٢ ٢٥٠ ٠٠٠ | ٤٠٠ ٠٠٠ | |
| ٢٠٠٥ | ٧ ١٥٠ ٠٠٠ | ٣ ٠٠٠ ٠٠٠ | ٤٩٠ ٠٠٠ | |

## ژێدەرێن بەشێ شەشێ


١- د. حربي محمد موسى عريقات، مبادئ الاقتصاد: التحليل الكلي، الطبعة الاولى، دار وائل للنشر و التوزيع، عمان، ٢٠٠٦.

٢- حسام داود و مصطفى سلمان و عماد الصعيدي و اخرون، مبادئ الاقتصاد الكلي، الطبعة الثانية، دار المسيرة للنشر و التوزيع و الطباعة، عمان ٢٠٠١.

٣- د. حسن علي سليمان، اقتصاديات العمل و سياسات الاستخدام، الكويت، ١٩٨٥.

٤- د. خالد واصف الوزني و د. احمد حسين الرفاعي، مبادئ الاقتصاد الكلي بين النظرية و التطبيق، الطبعة السابعة، دار وائل للنشر و التوزيع، عمان، ٢٠٠٤.

٥-سوزان لي، ابجدية علم الاقتصاد، ترجمة: خضر نصار، مركز الكتب الارديني، دون مكان، ١٩٨٨.

٦-طاهر حيدر حردان، مبادئ الاقتصاد، الطبعة الاولى، دار المستقبل للنشر و التوزيع، عمان، ١٩٩٧.

٧- د. عادل فليح العلي و هناء هادي محمد علي و شاؤول ايشو، اقتصاد العمل، مطبعة جامعة الموصل، الموصل، ١٩٩٠.

٨- د. علاء شفيق الراوي و د. عبدالرسول عبد جاسم، اقتصاد العمل، الطبعة الثانية، مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل ١٩٨٦.

٩- ــــــــــــ و ــــــــــــ، اقتصاد العمل، الطبعة الثانية مزيدة، مطبعة العمال المركزية، بغداد، ١٩٨٩.

١٠- د. صادق مهدي السعيد، عقد العمل و الاجور في الاسلام، بحث منشور في ندوة الاقتصاد الاسلامي، معهد البحوث و الدراسات العربية، بغداد ١٩٨٣.

١١- د. علي عبدالوهاب نجا، مشكلة البطالة و اثر برنامج الاصلاح الاقتصادي عليها دراسة تحليلية –تطبيقة، الدار الجامعية، الاسكندرية، ٢٠٠٥.

١٢- د. مجيد علي حسين و د. عفاف عبدالجبار سعيد، مقدمة في التحليل الاقتصادي الكلي، الطبعة الاولى، دار وائل للنشر و التوزيع، عمان، ٢٠٠٤.

١٣- محمد سلمان محمد، بطالة الخريجين في اقليم كوردستان (دراسة تطبيقية في مدينة اربيل)، مجلة الادارة و الاقتصاد، العدد ٥٢، الجامعة المستنصرية، بغداد، تموز ٢٠٠٤.

14- Belton, M. Fleisher, “Labor Economics: Theory and Evidence”, Prentice Hall Inc, New jersey, 1970.

15- Delong, J. Bradford, “Macroeconomics”, Intl ed. McGraw-Hill, Inwin, 2002.

16- Smith, W. Stephen, “Firt ed. Routledge”, London, 1994.

17- Whitehead, Geoffrey, “Economics”, Intl ed. Heinemann, London 1988.

18- Zinmermann, “Frontiers in Economics”, Springer, Berlin, 2002.

# پشکا حەفتێ

## جیهانگیری ( العولمة )

## GLOBALIZATION

### تێگەهێ جیهانگیریێ: The Concept Of Globali zation

ل سالێن نۆتان ژ سەدێ بیستێ گەلەك گوهۆرینێن جیهانییێن بلەز و کاریگەر ئێك لدویف ئێکێدا روویدان، کو شونوارێن خۆ لسەر نێرینێن پاشەرۆژێ هەبوون، براستی ئابوورێ جیهانی کره گوندەکێ بچویك، گوندەکێ کو چەندین پێگەو لایەنا تێدا گەشەکر، ئەڤە ژی ژ ئەنجامێن شۆرشا تەکنولوجیا و زانیارییان رویدان، ب ڤی شێوەی ئێك بازار د چارچۆڤەکێ بەرفرەهدا هاتە دامەزراندن و بیاف بۆ سەرجەم هەڤرکان و مامەلێن نێڤدەولەتی ڤەکر، ب جۆرەکی کارتێکەران دبازارێن جهانیدا بتنێ حکومەت و دەولەت نینن، بەلکو رێکخراوێن جیهانی و کومپانییێن فره رەگەزن و گەلەکۆمێن ئابووری ژی (التکتلات الاقتصادیة) ڤەدگریت.

بازارێت جیهانی و لڤینێن نرخان و گوهۆرین لسەر قەباره و جۆرێ بەرهەمی و ئارستێن بازرگانییێن جیهانی و لڤینێن سەرمایەداری درستکر، کو بشێوەکێ کاریگەر د جامبازییێنن (Spread) نێڤ دەولەتی دا دهێتە بکارئینان بتایبەتی جامبازێن کومپانییێن فره رەگەز، کو ب بەردەوامی کاری ژ بۆ کێمکرنا مەزاختی و تێچوونێن ڤەگوهاستن و گەهاندنێ دکەن و پاشی هەولا بدەستڤەئینانا تەکنولوجیا مەزن ددەن هەتا وەکو جیهانگیری بهێتە گۆرێ.

لسەر ڤی بنەمای جیهانگیری (Globlization) بەلاڤبوو (ل روویێ زاراڤەی ب رامانا بژندن و بەلاڤکرنا تشتەکی و بەخشینا مورکەکا جیهانی بۆ وی تشتی و بەرفرەهکرنا وی بازنەی، داکو هەمی جیهانێ ڤەگریت) ل سەرجەم ئاستێن بەرهەمئینانێ و پارەدارکرنێ و دارایی و تەکنولوجیا و خستنا ناڤ بازاری و کارگێری، ژ لایەکێ دیڤە چەندین جۆر و بیاڤێن پراکتیزەکرنێ هەنە و چەندین شێوە ژی هەنە.

بۆ نموونە جیهانگیرییا ئابووری هەیە کو ب بنەرەت و ژێدەریێ هەمی شێوێن دی دهێتە دانان کو دابەش دبیتە سەر جیهانگیرییا بەرهەمئینانێ و جیهانگیرییا دارایی، هەڤدەم چەند پاشکۆیەکێن دیێن جیهانگیرییا ئابووری هەنە ژ وانا جیهانگیرییا رامیاری و جیهانگیرییا رەوشەنبیری و جیهانگیرییا کومەلایەتی.

## پێناسا جیهانگیرییا ئابووری:-

بۆ پێناسەکرنا جیهانگیریێ پێناسەکا ئێکگرتییا سەرتا سەر کو لسەر رێککەفتی بۆ زاراڤێ جیهانگیری (Globlization) نینە، ژبەر ئالۆزییا ناڤەرۆکا هزرا وی زاراڤی و تەوەرێ ئابووری دگەل تەوەرێن دیێن رامیاری و رەوشەنبیری و کومەلایەتی و تەکنولوجیا و زانیاری تێکەلی ئێکودوو بووینە، لەورا جیهانگیری زاراڤەکێ دینامیکییە و دگەل گوهۆرینێت جیهانی دلڤیت و دروست دبیت و پێك دهێت.

د ڤێژیدا جیهانگیری بشێوەکێ سەرەکی بنەرەتی زێدەتر لایەنێ وێ یێ ئابووری یێ زالە لسەر بیاڤێن دی، کو دبیت ئەو بیاڤێن دیتر ب پاشکۆیێن جیهـــانگیرییا ئـــابووری دابنین، جیهانگیرییا ئابووری تێگەهەکە

گەلەك بلەز لسەر هەمی ئاستێن بەرهەمێنانێ و دارایی و تەنكنولوجیا و خستنا ناڤ بازاری و كارگێری بەلاڤ دبیت، د زانستێن ئابووریدا وەكو ئامرازەكێ ڤەكولینێ دەردكەڤیت بۆ دەستنیشانكرنا پروسێسا گوهۆرینا ئەوان بیاڤان، لسەر چاڤ وەرگرتنا وێ چەندێ كو جیهانگیری پروسەكا بەردەوامە، برێكا بكارئینانا نیشانێن چەنداتی و چەوانیێ دبیاڤێن پراكتیكیێن جۆرە و جۆردا دبیت تێبینیا وێ بكەین، هەروەسا دبیت برێكا پروسێن بنەرەتی یێن كو جیهانگری ل دوورخۆ دزڤریت تێبینی بكەین، كو هەڤركی و داهێنان و تەكنولوجیا و ئازادكرنا بازرگانییا نێڤدەولەتی و نویكرنە ڤە و بەلاڤكرنا جیهانگیرییا بەرهەمی و جیهانگیرییا داراییە، كو پێكهێنەرێ سەرەكییێ جیهانگیرییا ئابوورییە لوی بیاڤێ كو: هەردوو پروسێن داویێ (جیهانگیرییا بەرهەمی و جیهانگیرییا دارایی) لسەر بنەمایێ پشت بەستن ب ئالوگورییا (مبدأ الاعتماد المتبادل Interdependence ) هەڤپشك هاتییە دامەزراندن.

دشێن بێژین: دارشتنا پێناسەكا هویر و زانستییانە بۆ جیهانگیریێ كارەكێ بساناهی نینە، ژبەر زۆرییا پێناسان، كو یا لسەر بنەمایێ كاریگەرییا هزر و نێرینێن جۆرە و جۆرێن نڤیسەر و ڤەكۆلەرێن ئایدیۆلۆجی و نێرینێن وان بۆ جیهانگیریێ پەسەند بكەن یان رەتبكەن هاتییە دامەزراندن. ژ بۆ نزیكبوون ژ پێناسەكا سەرانسەری (شامل) بۆ جیهانگیریێ پێدڤییە سێ لایەنا لبەر چاڤ وەربگرین دەربارەی روهنكرنا ناڤەرۆكا وێ:

١-لايەنێ ئێکێ: پەیوەندی ب بەلاڤکرنا زانیاری و شۆرشا زانیاریا ڤە هەیە کو لبەردەم سەرجەم هەڤوەلاتیان بهێتە دابینکرن.

٢- لایەنێ دووێ: هەڤبەندی ب ژناڤبرن و راکرنا ئاستەنگ و بەربەستێن سنووری هەیە دناڤبەرا ولاتاندا.

٣-لایەنێ سیێ: زێدەبوونا رێژا لێکنزیکبوون و وەکئێیکبوونێ دناڤبەرا گرۆپان و جڤاکان و دام و دەزگەهان.

سەرجەمێ ئەڤان پرۆسان رەنگە کارتێکرنەکا خراب لسەر هندەك ئابوورییان هەبیت و بەروڤاژی بۆ هندەك ژ ئابوورییێن دی ب ئەرێنی دەربکەڤیت. ئەڤە ژی ب لبەر چاڤ وەرگرتنا ئەڤێ: جیهانگیری ب رێکا تەکنولۆجیا و گەهاندن و هەڤرکی و دان و ستاندنا نموونەیی یا دەزگەهان رووبددەت، کۆ برێکا میکانزمەکا دیارکری برێڤە دچیت و دبێژنێ: میکانزمێن جیهانگیریێ.

## میکانزمێن جیهانگیریێ:

ژ هەمیان گرنگتر:

١-نویکرنەڤە.

٢-شۆرشا تەکنولۆجی و زانیاری.

دگەل ئەڤان هەمیا ژی زانینا گرنگترین پێناسێن جیهانگیریێ کارەکێ پێدڤییە، هەولەکە بۆ ب ناڤداچوونە بۆ ناڤ رەهندێن هندەك جودا جودا یێن ئەڤی تێگەهی، بەلکو هەولەکە بۆ گەهشتن ب پێناسەکا گونجای:

زاراڤێ جیهانگیری (Globlization) ئاماژه ب پروسەیەکا کوێر و چری یا پرنسیپێ پشت گرێدان ب ئالوگۆرییا دناڤبەرا دوو بکەران (Actors) د ئابوورێ جیهانێدا دکەت، بشێوەکی رێژا پشکداربوونێ د ئالوگۆریێن نێڤ دەولەتی و هەڤبەندیێن ئابووریێن نێڤدەولەتیدا زێدە دبیت، ژ روویێ ئاست و قەباره و گرانییا سەرجەم بیاڤان ژ هەمیان گرنگتر شمەك و خزمەتگوزاری و توخمێن بەرهەمی، بشێوەکی سەرجەمێ ئەڤان بیاڤان د پرۆسا ئالوگۆرییا بازرگانی یا نێڤدەولەتی دا گەشە دکەن و رێژەکا گرنگ ژ چالاکییا ئابوورییا گشتی پێك دئینن، شێوازەکێ نوی د هەڤبەندیێن ئابووریێن نێڤدەولەتێن ئابوورێ جیهانی دروست دبیت و رۆلەکی گرنگ و مەزنتر دبینت ب هەڤبەرکرن دگەل چالاکییا ئابوورییا ناڤخۆ.

دشێین بێژین ژ بۆ ب جیهانیبوونێ چەند دابەشبوونەك هەنە، (ژ وانا جیهانەکا ڤەکری بیت و گرێدای چ قەید و ئاستەنگان نە بیت)، (رەنگە ژی گرێدای چەند جۆره مەرجەکان و رێنماییەکێن دیارکری بیت) ، (یان جیهانا ئایینی و زانستی و ئایدیۆلۆجیێ بیت چونکی ڤەکرن (ڤەبوون) بروویێ جیهانێ، برێکا هەولدانێ بۆ بەلاڤکرنا هزرەکێ یان بیرو باوەرەکی یان پرۆگرامەکی لسەر ئاستێ جیهانێ و دانپێدان ب بیروبۆچوونێن بەرامبەر دیاردەر دکەڤیت) ئانکو بەرەڤ وی ئاراستەی دچیت دەسهەلاتێ بۆ بهای و بیروباوەرەکێ جیهانی دناڤبەرا مللەتاندا بەلاڤ بکەت وەکو ئەوا هەردوو ئاینێن ئیسلامی و کرستیانی (مسیحی) پێ هاتین کو دو بانگەوازێن جیهانینە گازییا جیهانبوونێ دکەن، مافێن مرۆڤی و ئازادیێن بنەرەتی و لێبورین و دادوەریێ دابین دکەن، بیروباوەرێن دیژی ب هەمان شێوە.

بەلێ جیهانگیری بوێ دهێته جوداکرن کو سەروەرییا بازارێ جیهانی ددەستدا بیت و بەلاڤبوونا تەکنولوجیا یا زانیاری و راکرنا سەرجەم قەید و ئاستەنگان لناڤخۆ یان لدەرڤە پەیرەو دکەت هەر ئێك ژ بۆ کونترۆلکرن و ب هەڤشێوەکرنا حەز و ئارەزوویان و رۆخسارەکێ دیارکری ب کریار و بکارئینان و ب گەشەپێدانێ ددەت و ئێك رەوشەنبیری و کەلتور لسەر .................. د چەسپینیت، هەولا چەسپاندنا کەتوارەکێ (واقع)ێ نوی ددەت برێکا بەنکا زانیاریان کو سەرجەم کاران بۆ داتایەکێ هژمارەیی دگوهۆریت.

## دیرۆکا پەیدابوونا جیهانگیری ( جیهانیبوونێ ):

دیرۆکا پەیدابوونا جیهانگیریێ هەتا نهۆ جهێ دانوستاندن و بیر و بۆچوونێن جودایێن ڤەکۆلەران و هزرمەندانە، گەلەك جاران ب دیاردەکا تازە دهێتە ناڤکرن. کەسێن دیێن شەهرەزا ب پیرۆسەیەکا مێژووی بناڤ دکەن کو د چەند قوناغەکێن جودایێن دیرۆکی را دەربازبوویە.

ئەڤی بەحسی پیچەك ب درێژی و هویر بینی درێژتر دێ بەحسی کەین بۆ هندێ بۆ مە دیاربیت کا دیاردەکا تازەیە یان یا مێژووییە، درێیا ئەڤێ بەحسکرنێ دا: ڤەکۆلەرێن دیرۆکی وەسا هزردکەن کو: بەردەوام هێزەکا مەزن هەیە د سەرکرداتیا جیهانێ دا و دەست بسەر دا گرتنێدا (کونترۆلکرنێدا) یا بالا دەست بیت، یونان و رۆمان و فارسی و تەتەرو ئیمپراتۆرییەتێن تازە هەمی بڤی ئاراستەی بەرەڤ کونترۆل و خۆ سەپاندنێ چوون.

دیرۆکناس ڤەکولینێ لسەر زاراڤێ جیهانیبوونێ دکەن ئەڤە ژی روهن دبیت برێکا خستنە روویا هزرمەندێن شەهرازەیێن ئەپینا کو ل سەدێ سیێ بەری زایینێ بچاڤەکێ سەرانسەری تەماشەی جیهانێ د کربێ کو چ جۆرە هۆکارێن ژێك جوداکرن و ژ هەڤناسینێ، دیاربکەن ئاها لڤێرە گازیکرنا وان ژ بۆ دامەزراندنا باژێرەکێ جیهانی (المدينة الفضلة) دڤێرەژیدا هزرمەندێن شەهرەزا پشتا خۆ ب فەلسەفەکێ ڤەگرێدابوو کو لسەر بنەمایێ ئێکانەییا ئەختەرێ ئەردی کو سەرجەم رەگەزێن مرۆڤاتیێ لسەر دژین دبنیاتدا ئێك رەگەزن.

رۆمانیانژی کاریگەرییا ڤی بیروباوەری لسەر هەبوو بتایبەتی ئەوا هەڤبەندی ب هزرا (یاسایا سرۆشتی) و (پرنسیپێ دادوەرییا گشتی) ڤە هەی، شیشرۆن (١٠٦ - ٤١ ب / ز) بیردۆزا خۆ پێشکێشکر کو لسەر بنەمایێ ئێك یاسا دامەزرابوو کو دەسهەلات لسەر هەمی هەڤوەلاتیان هەبوو، ئەوژی یاسایا سرۆشتی بوو کو ب دەستوورێ جیهانی دهێتە ناڤکرن، کو لدویڤدا روما شیا جیهانێ بێخیتە دبن کونترۆلا هزرا ئیمپراتۆرییا جیهانی، هزرمەندێن یۆنانی و رۆمانیان هزرا هەبوونا جیهانەکێ دامەزراند کو هەمی مرۆڤاتی تێدا بیت و دبن کونترۆل و دەسهەلاتا ئێك یاسا دا بیت ئەو ژی (یاسایا سرۆشت) ی یە.

گەلەك ژ ڤەکۆلەران لدەڤ وان وەسایە کو جیهانگیری دیاردەکا تازە نینە، و بۆ سەدەیێن کەڤن ناڤەگەریتن بەلکو بۆ دەستپێکا سەدێ نوزدێ دگەل دەستپێکرنا کولۆنیالیزما (الاستعمار) ئەوروپی بۆ ئاسیا و ئەفریقیا و هەردوو کیشوەرێن ئەمریکا، پاشی کەفتە دبن کاریگەرییا سیستەمێ بازرگانیا تازە ڤە.

ل ئەوروٚپا، ئەڤێژی وەکر ستەمەکێ جیهانی یێ ئالۆز و تێکەل درست بیت کو ب جیهانبوونێ و لدویڤدا ب جیهانگیریێ هاتە ناڤکرن.

دڤی چارچوڤەیدا هندەکا ژوانڤە وەسایە کو زاراڤێ سیستەمێ جیهانی ل کونگرێ ڤیەننا ١٨١٥ ز بکارهاتییە، ئەو کونگرێ (مەترنیخ) ێ سەرۆك وەزیرێن نەمسا رێبەرییا وی کری و (بسمارك) ێ ئەلمانی ل نوتێن سەدێ نۆزدێ پێشڤە بریە، لسەر دەستێ (کلیمانسۆ)ێ فرەنسی د کونگرێ ڤرسای دا سالا ١٩١٩ نویکرەڤە، ل جەنگێ جیهانیێ دووێ ل ناڤەراستا سەدێ بیستێ لسەر دەستێ هەڤپەیمانان ل (یالگە) بەردەوامی پێ هاتە دان.

جیهان دناڤبەرا قوناغەکێ و قوناغەکا دی یان ژ ویستگەهەکێ بۆ ویستگەهەکا دی دڤیا سیستەمێ نێڤدەولەتی دارێژیتە ڤە، کونگرە ژی بۆ ئەڤێ مەرەمێ هاتنە گرێدان د هەر جارەکێ دا ساخلەت و شێوازەکێ جودا بخۆڤە دگرت، سیستەمێ نێڤدەولەتی کو ل سەدێ نوزدێ هاتییە دامەزراندن لداوییا کونگرێ ڤیەننا، سیستەمەکێ نێڤدەولەتیێ سەربازیێ کولونیالیزمی بوو، بەلێ کونگرێ ئاشتبوونێ کو ل دەستپێکێن سەدێ بیستێ هاتە گرێدان سیستەمەکێ نێڤدەولەتیێ ئیمپرایالزمی دامەزراند، نهۆ رۆژئاڤای دڤێت بگوهۆرببت ب سیستەمەکێ تازە کو هەمی نیشان و گرۆڤە وێ دەردئێخن کو سەدێ بیستێ دڤێت ئێك سەرمایەدارییا ئابووری هەبیت.

وەسا دهێتە دیتن کو جیهانگیریێ هەمان روسخارێ دیاردا سەرمایەداری بخۆڤە گرتبیت، ئەگەر بهێت و جیهانگیری داخازا زێدەکرنا هەڤبەندیێن

پێککگوهۆرینا ئابووری دناڤبەرا ولاتاندا بکەت و بانگەوازییا زێدەکرنا رێژا ڤەگوهاستنا سەرمایە و زانیاری و هزر و بیران بکەت، هەمی ئەڤان دیاردێن کەڤن دیاردا سەرمایەدارییێ ئینا گۆرێ، و بەردەوامبوونا ئەڤێ وەکهەڤیا روخسارێ دیاردا جیهانگرییێ گرۆڤەیەکە بۆ هەبوونا هەڤبەندییێ دناڤبەرا جیهانگیرییێ و ئەوێ دیاردا سەرمایەداری کو لبەری هنگی هەبوو.

جیهانگیری برێکا سێ قوناغێن سەرەکی گەهشتە ئەڤی روخسارێ هەڤچەرخ یێ کو نهۆ هەی:

١- قوناغا مارکانتالی (بازرگانی) و سەرمادارى یا بازرگانی دناڤبەرا سالێن (١٥٠٠ - ١٨٠٠).

٢-قوناغا پیشەسازی دناڤبەرا (١٨٠٠ - ١٩٥٠).

٣-قوناغا سەرمایەدارییا هەڤچەرخ ژ ١٩٥٠ ز و هەتا نهۆ.

بڤی رەنگی بۆ مە دیاربوو کو جیهانگیری بتنێ ماوەیەك نینە. بەلکۆ پاشەرۆژەکا بەردەواما سەرمایێ داراییە، کو د هەر قوناغەکێدا ب شێوە و روخسارەکێ جودا دەردکەڤیت، دیاردەکە ب بەفرەهبوون و بەلاڤبوون و دەستبسەرداگرتنا گەلان دهێتە ناڤکرن، ژبەر کو سەرمایەداری دپێشکەفتنەکا بەردەواما پرۆسا بەرهەمئینانێ دایە، لەورا پێدڤیە دگەل پێدڤیێن هەر قوناغەکا کو جیهانگیری تێدا دبووریتن خو بگونجینیت و وی رۆلی لبەر چاڤ وەربگریت کو پێدڤی ب نویبوونەڤەیا هۆکارۆ سالوخەتێن وێ هەیە.

ئەو سالۆخەت و نیشانا جودایا کو ئەڤ قوناغا نهۆ جیهان تێدا دەربازدبیت پێکهاتییە ژ ڤەگوهاستنا سەرمایەدارییێ ژ شێوازێ سەرمایەداری یا نشتیمانی و فرە رەگەز، بۆ سەرمایەدارییا جیهانی، ئەو گوهۆرین و چاکسازیێن کو جیهانێ سالێن هەشتێیان و دەستپێکا نۆتان ژ سەدێ بیستێ بخۆڤە دیتین بووینە ئەگەرێ تێکچوونا وی سیستەمێ هەیی کو لسەر دوو جەمسەرێن سەرەکی هاتبوو دامەزراندن (نەتەوێن ئێکگرتی و ئێکەتیا سوڤیەتی یا جاران) بۆ دەرکەفتنا دەسهەلات و کونترولا ئەمریکی بتنێ، گرنگترین گوهۆرینێن سەدێ رابردوو بتایبەتی لدەستپێکا سالێن نوتان پێکهاتبوون ژ:-

١- ژ ناڤچوونا مەزنترین زلهێزا هەڤرکیێ و هەلوەشیان و نەمانا سەرجەم ئایدیولۆجییێن دژی سەرمایە دارییان کو (کومونیستە - الشیوعیە).

٢-روویدانا قەیرانا کەنداڤی یا دووێ (١٩٩٠ - ١٩٩١).

٣-دەرکەفتن و مانا ئەمریکا بتنێ ژ بۆ سەرکردایەتیکرن و برێڤەبرنا جیهانێ پشتی هەر فتنا هەمبەرێ وێ (کۆمپونیستە) (ئێکەتیا سوڤیەتی) بوو.

٤- شۆرشا پشەسازی چوویە دناڤ قوناغا سیێ دا، کو خۆ دشۆرشا زانین و زانیاریاندا ددیت و بشوەکی بەلاڤبوو کو عەقلێ مرۆڤی باوەر نەکەت.

پێدڤی بوو ئەو سیستەمێ نێڤدەولەتییێ کو ل پشتی جەنگێ جیهانییێ دووێ (پشتی سالا ١٩٤٥) د بنەمایێن سیستەمێ نوی یێ جیهانێ راگەهاندبا و گرنگترین روخسارێن وی پێکهاتبوون ژ:

١-رووهنبوونا دیاردا پشت گرێدانا نێڤدەولەتی و ئەو دابەشکرنا نوی یا وەلاتان ژ بۆ کارکرنێ.

٢-کێشە و دۆزێن گرنگێن جیهانێ سیمایەکێ نێڤدەولەتی و جیهانی وەرگرت.

٣-ئەو گوهۆرینا مەزن یا کو بسەر تێگەهێ کەڤن یێ سەروەرییا نیشتمانی دا هاتی.

٤- تەڤینا شۆرەشا زانیاری و تەکنولۆژیا، کو شۆرەشەکا مەزن بوو دبیاڤێن گەهاندن و ڤەگوهاستنا زانیارییان و بلەز و بەرزییا ئالوگورکرنێ و داهێنانێدا.

٥- پشت گرێدان ب (کۆم کۆمێن) هەرێمی کو شێوازەکێ ململانێ و هەڤرکییێ دناڤبەرا واندایە و نە گەهشتییە ئاستێ داژایەتیکرنێ.

بڤی رەنگی جیهانگیری وەسا دەرکەفت کو پێشکەفتنەك بوو د سەردەمێن دیرۆکیێن کەڤندا پلان بۆ هاتییە دانان، ئانکو ئەڤ پرۆسە درێژە پێدەرەکە دیرۆکا خۆ هەیە. بەلێ ئەوا نهۆ وێ جودا دکەت ژ بەری هنگی ئەو چڕییا ئالۆگورکرنا بلەزا بەلاڤبوونا وێ یە دناڤبەرا وەلاتاندا، ئەڤە ژی لبن سیبەرا بەلاڤبوونا شۆرەشا زانیاری و تەکنولوجیا و پێشکەفتنانە.

## ساخلەتێن جیهانگیریا ئابووری :

سەحکرن ل ناڤەرۆکا هزر و هەتا دیرۆکا جیهانگێری چەند ساخلەتێن سەرەکی یێن هەین کو ل دویف هندێ جیهانگێریێ ژ زاراڤێن دی یێن خودان کو هورینێن ڕهو ڕیشالی جودا دکەت، گرنگترین ئەو ساخلەت پێکهاتینە ژ:

### ١- دەستگرتن ب سەر میکانزما بازاری و هەولدان بۆ ب دەستڤەئینانا شیانا هەڤرکیێ:

ئەوا کو جیهانگێریێ جودا دکەت ئەوە کو دەستی دانیتە سەر میکانزما بازاری و تێکەلکرنا وی دگەل دیموکراتیەتێ، ل جهێ سەرانسەری و بریاردانێ ل چارچوڤێ هەڤرکیێ و نموونەیێ و ژێهاتیا تەمام و وەرگرتنا شیانا هەڤڕکیێ کرنێ ب رێکا مفا وەرگرتنێ ژ شۆرەشا تەکنەلۆژی و شۆرەشا پەیوەندی کرنێ و ڤەگوهاستنێ و زانیاریان ب دەستڤەبینیت، ب هێزکرنا ڤان شیانان د بەرهەم ئینانێ دا ب کێمترین تێچوون کو هەی و ب باشترین شێوە و ب زۆرترین بەرهەم و فرۆشتنا وی ب نرخەکێ هەڤڕکیێ گونجایی. ئەڤە هەمی ژی پێدڤیە ب کێمترین دەم و ماوە بهێتە ئەنجام دان، دەم بویە ئێك ژ شیانێن هەڤڕکیێن گرنگ کو دبیتن ددەمێ مامەلەکرنێ دا دگەل جیهانگێریێ ب دەستڤە بینیت، لەورا جیهان دبیتە گوندەکێ بچویك هەڤرکیا هەمە لایەن و شێوازێ دابەشکرنا کارێ نیڤ دەولەتی تێدا دهێتە گوهۆرین، کو دگەل بەرهەم ئینانێ یان جیهانیا بەرهەمی و جیهانیا بازاڕی بگونجیت بڤی شێوەی هەمی کەرت و بشك ژ پێکهاتێن بەرهەم ئینانا شمەکەکی ی (کەلۆپەلەکی) ل جهێن جودایێن جیهانێ دهێتە بەرهەم ئینان، وەدکەت بریارێن

بەرهەمی و وەبەرهێنانێ ل دیتنا جیهانییڤە دهێتە دان، و بەرچاڤکرنا ئابوورێ پێگەهشتی دبیاڤێ پەیوەندی ب تێچوون و داهاتی ڤە هەی.

## ٢- داینا میکیا ( حرکیة ) تێگەهێ جیهانگیریێ:

پرانیا ئەو پێناسێن تایبەت ب جیهانگیریێ ڤە ئاماژە ب داینامیکیا جیهانگیریێ دکەن. کو رۆژ ل دویڤ ڕۆژ پتر دچەسپیت ب گرۆڤێ ئەگەرێ گوهۆرینا هەڤسەنگیا هێزێن ئابووری ل نهۆ و پاشەرۆژێ دا، ب شێوەکی ل هەڤرکییێدا هەمی رووی ب روویێ ئێك و دوو ببن، ژوان ژی (ویلاتییێن ئێککگرتییێن ئەمریکا) کو ب هەمی هێز و شیانێن خۆ هەولا دەست ب سەرداگرتنا شیانێن هەڤڕکیێ ددەت، بۆ هندێ بشێت هەڤڕکیێ دگەل سەرجەم لایەنێن تازە دەرکەفتین بکەت دوێ مەیدانێ دا کو پێنگاڤێن لەز بەرەڤ پاشەرۆژێ دهاڤێژن وەکی چینێ.

داینامیکیا جیهانگیریێ ب هندێ کویرتر دبیت، دەمێ جیهانگیری هەولا ڕاکرن و ژناڤبرنا سنۆرێن سیاسی ددەت و ب زۆری کاریگەریێ ل سەر ڕۆلێ دەولەتێ د چالکیا ئابووری دا دبینت، بەلکو داینامیکیا جیهانگیریێ دەمێ ئەنجامێن ئاریشە و ململانێ ئێك لا دکەت و وی دەمی دیار دبیت ل وان دژەکارڤەدانا کو ژ لایێ سوودمەندان ڤە بارێ ئابووریێ ئەڤرۆ رووی دەت، کو ب هەمی شێوەکی هەولا پاراستنا دەستەکەفت و بەرژەوەندییێن خۆ ددەن. هەڤ دەم کارڤەدان و دژایەتیکرنا پاشەرۆژێ ژی ل وی بارودۆخی ب تایبەتی ولاتێن تازە پێگەهشتی هەولددەن ب رێکا کۆم کۆم (تکتل) و ئێککگرتنان بەرڤانیێ ژبەرژەوەندییێن خۆ بکەن،

ئەڤ حالە تە ژی ل پێنجەمین کومبوونا رێکخراوا بازرگانیا نیڤ دەولەتی ل مەکسیك (سالا ٢٠٠٣) دیار بوو.

### ٣- ئاراستیێ پشت گرێدانێ ب ئابووریێ پێك گوهۆڕ:

ئەڤ ئاراستەیە بەرەڤ پشت گرێدانێ ب بێك گوهۆڕینێ کویر دبیت (Interdependce) ژ ئەنجامێ ئەو گوهۆڕینێن کو ل دەهێ نوتان (عقد التسعینات) روویداین پشتی رێککەفتناما ئازادکرنا بازرگانیێ و زێدەبوونا سەر بەستیا هاتن و چوونا سەرمایێ نێڤ دەولەتی، ئەڤە ژی هەڤدەم بو دگەل شۆرەشا زانیاریان و تەکنەلۆژیاییێ، کو دبن سیبەرا جیهانگیری دا ئاستەنگ و بەربەستێن دووریا ولات و کیشوەران نامینن، دگەل زێدەبوونا ئەگەرێن کارلێکرنێ بەرامبەر ڤەدیتنا جۆرەکی ژ دابەشکرنا کاری نیڤ دەولەتی، کو پرۆسا بەرهەم ئینانا پیشەسازی دناڤبەرا ولاتان دابەش دبیت.

### ٤- مەزن بوونا رولێ کومپانییێن فرە رەگەز:

جهێ ئاماژە پیدانێ یە کومپانییێن رەگەز کومپانییێن چالاکیێن جیهانینە، ب هەمی رامانان ب ئێك ژ سیماییێن سەرکیێن جیهانگیریێ دهێتە دانان، ب رێکا وان چالاکیێن دکەت ل شێویٚ وەبەرهێنانا راستەو خۆ ژ ڤەگوهاستنا تەکنەلۆژیا کاریگەریا زۆرا ب هێز دکەت سەر ئابووریێ جیهانی و شارەزایی و بازارگێریێ و کارگیری د داکوکی کرن سەر دیاردا جیهانگیریێ ل سەرجەم بیاڤێن بەرهەم ئینانێ و دارایی و تەکنەلوژیا و بازار و کارگێری:

زێدەباری ئەوان ژی ئەو کوپانییێن مەزن خودان شیانێن پارەدارکرنەکا زۆر، ڕۆلەکێ کاریگەر ل وێ شۆرەشا تەکنەولوژی دگێرن و شیاینە هونەرێ بەرهەم ئینانێ بگوهۆرن ب هونەرەکێ بەرهەم ئینانا ئالۆز و پر ژ زانیاریان، لەوڕا دڤی بیاڤی دا ئاراستێن خۆ بەرڤ جیهانگیریێ دبەن ب تایبەتی جیهانگیریا ئابووری.

## ٥- زێدەبوونا ڕۆلێ ڕێکخراوێن ئابوورییێن جیهانێ دریڤەبرنا جیهانگیرییێدا :

ئێك ژ ساخلەتێن گرنگێن جیهانگیریێ پێکهاتیە ژ زێدەبوونا ڕێکخراوێن ئابوریێن جیهانێ ل ڕێڤەبرنا جیهانگیریێ، ب تایبەتی ل پشتی هەرفتنا بەرەیێ سۆشیا لیستی و هەلوەشاندنا ئێکەتیا سوڤیتیا بەرێ، کو ڕێکخراوێن ئابوورییێن ڤی بەرەی هاتنە هەلوەشاندن و ڕۆلێ وان نەما، ل سالا ١٩٩٥ ڕکێخراوا بازرگانیا جیهانی هاتە دامەزراندن و پرانیا ولاتێن جیهانێ بوونە ئەندامێن وێ. ئەڤجا لایێ سیێ یێ دەزگەهێن سێستەمێ ئابووریێ جیهانێ تەمام بوو کو جیهانگیری گرنگترین سیمایێن وێ نە، بڤی ڕەنگی ل ڕێڤەبرنا جیهانگیریێ سێ ڕێکخراوێن سەرەکی هەنە، ب ڕێکا سیاسەتا نەختینەی (نەقدی) و دارای و بازرگانی کاریگەریێ ل سەر سیاسەتا ئابووریا سەرجەم ولاتێن جیهانێ دکەت کو ئەو ژی:

١-سندۆقا نەختی یا نیڤ دەولەتی.

٢-بانکا نیڤ دەولەتی و بشکێن وێ.

٣-ڕێکخراوا بازرگانیا جیهانی.

## ٦- کێم کرنا سەروەریا دەولەتی یا نەتەوەیی و لاوازکرنا سەروەریا نیشتمانی دبیاڤێ سیاسەتا نەختینەیی و داراییدا.

جیهانگیری بهندێ دهێتە نیاسین کو سەروەریا دەولەتێ یا نەتەوەیی لاوازکریە، ب تایبەتی بوویە ئەگەرێ بێهێزکرنا سەرمایێ نیشتمانی ل بیاڤێ سیاسەتا نەختی و دارایی، کو حکومەتا ل پرانیا وڵاتێن جیهانێ ناچار بوون دەستی ژ یاسایێن کونترۆلکرنا بازاڕان بەردەن و یاسایا بازارێ ئازاد پەیرەو بکەن، بتنێ بەری هندێ رێك و شێوازێ چاڤدێریا نوی ژی ڤەبینن.

هەر وەکی ئەزموونان دەرئێخستی چێکەرێن بریارا سیاسەتا ئابووری شیان نینن دگەل ئاراستەکرنا بازارێن دارایی ب تەمامی کەسێ سیاسەتێ ب ئێك دەم دا پەیرەو بکەت ، ئەو ژی نرخێ بێکگوهۆرینا جێگیر و ئازادیا بزاڤا ڤەگوهاستنا سەرمایەی و بلندکرنا نرخێ مفایێن (أسعار الفائدە) نافخۆ دۆم کورت ب جوداهییەکا نرخێ مفایێ جیهانی یێ دۆم کورت.

ب کورتی: دگەل بەرەڤ پێشڤەچوونا بەرەف جیهانگیریێ، ڕۆلێ وێ ل بەرژەوەندیا هێزا جیهانگیری ل دروستکرنا سیاسەتا ئابووریا نیشتمانی کێم دبیتەڤە ژ وان ژی دیارکرنا تێکراییێ وەبەرهێنانێ گەشەیا ئابووری و ئاستێ بکار ئێخستنێ و بێکاریێ و ئاستێ داهاتی یان خۆش ژ یاریا کومەلایەتی و ڤەژاندنێ یان راوەستیان و بێ بزاڤیا بازارێن دارایی و نرخێ پێکبگوهۆرینا دراڤێ نیشتمانی.

## جۆرێن جیهانگیریا ئابووری:

دەمێ ڤەکۆلین ل سەر جیهانگیریا ئابووری دهێتە کرن، دێ بینین جیهانگیری ل سەر دوو ئاستێن سەرەکی رووی دەت:

**ئێك:** ب شێوەکێ ب هێز دبیاڤێ بەرهەم ئینانێ دا دەردکەڤیت و دبێژنێ جیهانگیریا بەرهەمی کو پشتێ ب دوو ئاراستێن بنەڕەتی گرێ ددەت.

١- جیهانگیریا بازرگانیا نێڤ دەولەتی و رێککەفتنا ئازادکرنا بازرگانیا نێڤ دەولەتی ئەڤە ژی کارڤەدانا ب سەر گەشکرنا بازرگانیا نێڤ دەولەتی بلەز دەردکەڤیت.

٢-و بەرهێنانا بیانی یا ڕاستەوخۆ کو تێکرایێ زێدەبوونا وێ بلەزترە ژ تێکرایێ گەشەیا بازرگانیا نێڤ دەولەتی.

**دوو :** دەمێ جیهانگیریا ئابووری تێدا رووی بدەت ل بیاڤێ جیهانگیریا دارایی کو خو د گەشەکرنا بلەز یا مامەلێن داراییێن نێڤ دەولەتی دا دبینیت ژ ئەنجامێ ئازادکرنا دارایی پەیدا دبیت، کومپانییێن فرە ڕەگەز ڕۆلەکێ مەزن یێ هەی ل تمام کرنا بازارێن جیهانی ل بیاڤێ شمەك و پێشڤەچوونا شۆرەشا تەکنولۆژی و تمام کارێ سێستەمێ پەیوەندیان ڕۆلەکێ مەزن دبینیت ل کویرکرنا جیهانگیریێ د مەزنبوونا شۆرەشا تەکنولوژی و گەهاندنێ، کو دشێین بڤی شێوێ خوارێ بەحس بکەین:

## ئێك : جیهانگیریا بەرهەم ئینانێ:

جیهانگیریا بەرهەم ئینانێ ب رێژەكا زۆر ب رێكا كومپانیێن فرە ڕەگەز و بێ قەیرانەكا مەترسیدار بجه دئینیت، جیهانگیریا بەرهەم ئینانێ شێوازێن نوی ل دابەشكرنا كارێ نیڤ دەولەتی دروست دكەت، ئەڤ حالەتە ب شێوەكێ ئاشكرا دسرۆشتێ بەرهەم ئینانێ پیشەسازی دا دیاردبیت، دەولەتەك چەند یا پیشكەفتی بیت نەشێت ل ئێك جۆری بەرهەم ئینانێ ب تەمامی یا بسپۆر بیت بۆ نموونە ترومبێل ل چەند دەولەتەكا پارچێن وێ كۆم دكەت و بەرهەم دئینیت، ئامیرێن كارەبێ ژی ب هەمان شێوە و كومپیوتەر و ئامیرێن تەكنولۆژی ل چەند وەلاتەكان دهینە بەرهەم ئینان و پشكێن وان دهێنە كوم كرن، هەتا وەلێهاتی هەر ئێك ژ ولاتان بسپۆرایەتیێ ل جۆرەكی ژ پشك و پێكهاتێ سەركی یێ وی بەرهەمی دبیت، دڤی چوار چوڤەی دا بڕیارێن بەرهەم ئینانێ و بڕیارێن وەبەرهێنانێ ب دیتنا جیهانی ڤە دهێنە دان و ل دویڤ ژمێریاریا هویربینیا ئابووری تێچوون و داهات دهێنە بەرچاڤ وەرگرتن ئەڤ بارودۆخە دەلیڤەكا مەزن بۆ پرانیا ولاتێن تازە پێگەهشتی دروست كر، كو دشێن مفای ژێ وەربگرن و بچنە ناڤ بازارێ جیهانی ل بن سیبەرا جیهانگیریا بەرهەم ئینانێ و پشكداریێ ل پرانیا بەرهەمان بكەن.

### ١- ئاراستێ ئێكێ: جیهانگیریا بازرگانیا نێڤ دەولەتی:

دشێین ئەڤی ئاراستەی ژ نیشانێن تایبەتێن بازرگانیا نێڤ دەولەتی تێبینیا ئەڤێ بكەین:

أ- د دەهێ نوتێن (عقد التسعينات) سەدێ بیستێ دا بازرگانیا نێڤ دەولەتی بشێوەکێ مەزن و بەرفرەهـ زێدەکر، ب شێوەکی بازرگانیا جیهانی دوو جاران هند گەشەیا بەرهەم ئینانا نافخۆیا سەرجەم جیهانێ لێهات ل سالا ١٩٩٥ بەرهەمێ نافخۆیێ سەرجەمێ جیهانێ ب رێژا ٥٪ زێدەکر، ددەمەکی دا رێژا گەشەیا بازرگانی د هەمان سالدا ٩٪ زێدەکر.

ب_ زێدەبوونا تێکرایێ بازرگانیا شمەکێ نیڤ دەولەتی، کو تێکرایێ ناڤنجی یێ گەشەیا بازرگانیا نێڤ دەولەتی ل شمەك (کەل و پەل) و خزمەت گوزاریان بۆ سالا ٢٠٠٠ بەراورد ب سالا ١٩٩٩ ب رێژا ٢،١١٪ زێدەکر ئەڤە ژی ب بهایێ ٧٧٥٩ ملیار دۆلاران، ددەمەکی دا بەرهەمێ نافخۆیێ سەرجەمێ جیهانێ ل سالا ٢٠٠٠ ب بهایێ ٣١١٧١ ملیار دۆلاران ب رێژا گەشەیا ٧،٤٪ ب بەراورد ب سالا ١٩٩٩ تومارکریە. ئانکو بازرگانیا نێڤ دەولەتی یاشمەك و خزمەتگوزاریان ب رێژەکا پتر گەشەیا بەرهەمێ نافخۆیێ سەرجەمێ جیهانی دوو جار و نیڤا زێدەکریە.

## ٢- ئاراستێ دووێ وەبەرهێنانا بیانی یا راستەوخۆ:

ل بن سیبەرا بنەمایێ نوی یێ دابەشکرنا کارێ نێڤ دەولەتی کو کریارا بەرهەم ئینانا ئێك جۆرێ شمەکی ب سەر چەند وەلاتان دابەش دبیت، ل سەر ئەڤی بنەمای کومپانیێن فرەرەگەز ستراتیژیەتا بەرهەمی و بازارگیریێ د دارێژن، کو جیهانێ ب ئێك بازار دادنن د رۆلێ هەر یەکەکێ ل پروسا بەرهەم ئینانێ ل دویڤ بەرنامە و پلانێن کومپانیا دهێتە دیارکرن ئاستێ گەشەیا وەبەرهێنانا راستەوخۆیا بیانی ب رێژەکا لەزتر و مەزنتر زێدەکر ل چاڤ گەشەیا بازرگانیا نێڤ دەولەتی و جیهانی، رێژا گەشەیا وەبەرهێنانا راستەوخۆیا بیانی دنوتێن سەدێ بیستێدا

ب تێكرایێ ١٢٪ زێدەكر، كومپانییێن فرە ڕگەز بۆ وی ڕادەی شیاینە كو سەرۆكاتیا ڤان ئاراستەیان بكەن، هەتا كو پشتەڤانیا پتر یا جیهانگیریێ بكەن، كو د ئەنجامدا چەندین هەڤپەیمانێن ستراتیژی دناڤبەرا وان دا دروست بوون، شوینەوارێن وێ ژی د سەرجەم بیاڤاندا دیاربوون ب تایبەتی دبیاڤێ تەكنولوژیا و بازاران دا.

ژ لایەكێ دی ڤە ئەو پێشكەفتنا گرنگ كو ل وەبەرهێنانا راستەوخۆیا بیانی ل نیڤا دوویێ یا نوتێن سەدێ بیستێ روویدای، پشكەكا مەزن لێشاوێ (تدفق) وێ وەبەرهێنانێ ل پروسا ئێكگرتن و تێكەلبوونێ بەرهەم دهێت. ئەوا دهێتە تێبینی كرن دڤی بیاڤی دا مەرەما ئێكگرتن و تێكەلبوونێ دەرڤەی سنووری ڤەدگریت بۆ حەزا كومپانییێن فرە ڕەگەز ل پەیرەوكرنا ڤی جۆرێ وەبەرهێنانا بیانییا ڕاستوخۆیە، ئەگەر بەراورد بكەن دگەل دامەزراندنا كومپانییێن نوی، چونكی كومپانیا دایك شیانا مفا وەرگرتنا مادی و مرۆڤی و تەكنەلۆژیا وان كومپانیا ڕادكێشیت و كونترۆلا وێ دكەت، ئەڤە ژبلی ژ كەلەكبوونا دابەش بوونا مەترسیان و زێدەكرنا قەبارێ چالاكیێن وێ، كو د ئەنجام دا دەسەلاتا هەڤركیی یا وێ كومپانییێ ل سەر ئاستێ جیهانێ بەرفرەهـ دكەت، بڤی جۆری ڕۆلێ كومپانییێن فرە ڕەگەز كو بەهرا پتر ب لێشا وی درژیتە ناڤ ولاتی ل دەولەمەندكرنا جیهانگیریا بەرهەمی كویرتر و بهێز تر دبیت.

## دو- جيهانگيريا دارايى:

جيهانگيريا دارايى پێكهاتيه ژ بەرهەمێ سەركيێ كريارا ئازادكرنا دارايى و گوهۆرينا وى دبێژنێ ڤەكرنا دارايى (الانفتاح المالى) كو بوويه ئەگەرێ تەمام كارى و گرێدانا بازارێن دارايێن ناڤخۆ ب جيهانا دەرڤە، ئەڤە ژى ب رێكا هەلوەشاندنا قەيدو زنجيران بەردەم بزاڤا سەرمايەى، كو ل سنوورێن وێ ڤە ب لێشا وى دهێنە ناڤ و درژنە ناڤ بازارێن دارايێن جيهانێ، ب شێوەكى بازارێن سەرمايەكێ پتر ب ئێك و دووڤە گرێداينە و تێكەلى هەڤ بووينە.

دشێين گرنگى و كاريگەريا جيهانگيريا داريى ب دوو نيشانان دياربكەين:

١- نيشانا ئێكێ: يا تايبەتە ب پێشكەفتنا قەبارێ مامەلەكرنێ سەر سنوورێ ل پشك و قەبالان (الاسهم و السندات) ل ولاتێن پيشەسازيێن پێشكەفتى، بەياننامە ئاماژە بهندێ دكەن كو ل سالا ١٩٨٠ مامەلێن دەرڤە ل ١٠٪ كێمتر بوويه ل سەرجەم بەرهەمێ نافخۆيێ ولاتێن پێشكەفتێن پيشەسازى، بەلێ ل سالا ١٩٩٦ ل هەر ئێك ژ ئەمريكا و ئەلمانيا گەهشتە ١٠٠٪ و ل فرەنسا و ئيتاليا و كەندا گەهشتە ٢٠٠٪.

٢- نيشانا دووێ: يا تايبەتە ب پێشكەفتنا بكارئينانا نەختێ بيانى ل سەر ئاستێ جيهانێ، ئامار ئاماژێ بهندێ دكەن ناڤنجيێ تێكرايێ مامەلكرنا رۆژانە ل ناڤ بازارێن پێكگوهۆرينا بيانى بتنێ (٢٠٠) مليار دۆلارێ ئەمريكى بوريه ل ناڤەراستا هەشتێين سەدێ بيستێ بەلێ ل سالا ١٩٩٥ ئەڤ ژمارە بۆ (١٢٠٠) مليار دۆلارێ ئەمريكى بلندبوويه ئانكو ب رێژا ٨٤٪ ژ سەرجەمێ يەدەكێ نێڤ

دەولەتی ل سەرجەم ولاتێن جیهانێ دوێ سالێ دا زێدەكرن.

ناڤەرۆكا جیهانگیریا بازارێن دارایێ ئازادكرنا حسابا سەرمایەیە، ئانكو راكرن و ژناڤبرنا  دوورپێچێ ل سەر مامەلەتێن ناڤ حسابا سەرمایە و دارایی ل تڕازیا پێدانێ، كو سەرجەم مامەلێن جۆرا و جۆرێن سەرمایەی ڤەدگریت، وەكی قەر و بشكا پارێزگارێ دارایی (Folio Port) وەبەرهێنانا ڕاستەو خۆ و خانووبەر و سامانێ تایبەتی و ئازادكرنا حسابا سەرمایەی، پاشی چاواتیا بەرچاڤ كرنا شیانا حسابا خودانێ دارایی بۆ پێككوهۆرینێ.

## میكا نزما جیهانگیریێ:

هێزێن كاریگەرێن سەرمایەداری ل سێستەمێ نێڤ دەولەتی هەولددەن جیهانگیریەكا ئابووری و ڕامیاری و كومەلایەتی و هزری و ڕوشەنبیری و هەتا یا سەربازی ژی ب رێكا كومەكا میكا نزم و هۆكاران  ب دەستڤەبینن كو ئەو ژی:

(دام و دەزگەهێن نەختی و دارایا جیهانی - دەزگەهێن بریتون وودز)، رێكخراوا بازرگانیا نێڤ دەولەتی (WTO) كۆمپانیێن فرە ڕەگەز (Multinational Compneis)، هەڤپەیمانا ناتۆ، مونتەدایێ ئابووریێ جیهانی (داڤۆس)

بڤی شیوەی دشیان دایە بهێتە گوتن جیهانگیریا ئابووری سێ سێستەمێن سەرەكی بخۆڤە دگریت، سێستەمێ نەختێ نێڤ دەولەتی، و سێستەمێ دارایی

نێڤ دەولەتی، و سێستەمێ بازرگانیا نێڤ دەولەتی، ب رێکا سێ رێکخراوێن ئابووریێن جیهانی رێڤەبەریا وان هەرسێ سێستەمان دکەت ئەو ژی پێکهاتینە ژ:

١- سندۆقا دراڤێ نێڤ دەولەتی International Monetary Fund

٢- بانکا ئاڤەدانکرن و گەشە پێدانا جیهانی: ( World Bank ( BW

٣- رێکخراوا بازرگانیا جیهانی ( World Trade Organization ( WTO

ئەڤ رێکخراوە ڕادبن ب رێڤەبرنا سیاسەتا ئابوورێ جیهانگیریێ، بۆ نموونە سندۆقا دراڤێ نێڤ دەولەتی بسپۆرە ب رێڤەبرنا رامیاریا نەختینەی، بانکا جیهانی تایبەتمەندی ل بیاڤێ سیاسەتا دارایی و رێڤەبرنێ هەیە، رێکخراوا بازرگانیا جیهانی بسپۆری د رێڤەبرنا سیاسەتا بازرگانیا جیهانی دا یا هەی. بەحس کرن و ڤەکۆلین ل سەر هەر سێ رێکخراوێن جیهانی کارەکێ پێدڤیە بۆ شارەزابوون ل میکانزما ب رێڤەچوونا جیهانگیریا ئابوری.

## ژێدەرێن بەشێ حەفتێ

١- بول هيرست، وجراهام تومبسون، ما العولمة: الاقتصاد العالمي وامكانات التحكم، تعريب الدكتور فالح عبدالجبار، سلسلة عالم المعرفة، العدد ٢٧٣، مطابع السياسة، الكويت، ٢٠٠١.

٢- د. جلال امين، العولمة و التنمية العربية من حملة نابليون الى جولة اوروغواي ١٧٩٨ ١٩٩٨، الطبعة الولى، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٩.

٣- جيريمي بريتشير، وتيم كاستيللو، القرية الكونية او نهب الكوني: اعادة البناء القتصادي من القاعدة الى الاعلى، ترجمة الحارث النبهان، الطبعة الاولى، دار المدى للثقافة و النشر، دمشق، ٢٠٠٤.

٤- د. سناء كاظم كاطع، الفكر الاسلامي المعاصر و العولمة، الطبعة الاولى، دار الغدير، بيروت، ٢٠٠٥.

٥- د. عبدالمطلب عبدالحميد، العولمة الاقتصادية (منظاتها، شركاتها، تداعياتها)، الدار الجامعية، الاسكندرية، ٢٠٠٦.

٦- د. محسن عبدالحميد، العولمة من المنظور الاسلامي، الطبعة الاولى، دون جهة للنشر، دون مكان للنشر، ٢٠٠٢.

٧- د. محمود خالد المسافر، العولمة الاقتصادية: هيمنة الشمال و التداعيات على الجنوب، الطبعة لاولى، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠٢.

٨- ميشيل شوسودوفسكي، عولمة الفقر: تأثير اصلاحات صندوق النقد و البنك الدوليين، ترجمة: جعفر علي حسين السوداني، الطبعة الاولى، بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠١.

9- Sarah Anderson, Tony Colin Hines and Other, "Alternatives to Economic Globalization: A Berrett World Is Possible", International, Forum On Globalization, Berrett – Kohler Publishers, Inc, san Francisco, 2002

# فەرهەنگۆك

| زمانێ ئینگلیزی | زمانێ عەرەبی | زمانێ كوردی |
|---|---|---|
| Free Economics | الاقتصاد الحر | ئابوورێ ئازاد |
| Market Economy | اقتصاد السوق | ئابوورێ بازاری |
| Economies of scale | اقتصاديات الحجم | ئابوورێ قەباره دار |
| Network Economy | اقتصاد المعرفة | ئابوورێ مەعریفی |
| Directed | التوجيه – الموجة | ئاراسته كرد |
| Desire | الرغبة | ئارەزوو حەز |
| Living Level | المستوى المعيشي | ئاستێ ژیارێ |
| Interdependence | يتعزز التبادل | پێكهور چر دبێت |
| Target Goal | الهدف | ئارمانج |
| Tools Instruments | الادوات | ئامراز |
| Function | الوظيفة | ئەرك |
| Financing function | الوظيفة التمويلية | ئەركێ پارەداركرنێ |
| Money Functions | وظائف النقود | ئەركێ دراڤی |
| Money Function | الوظيفة النقدية | ئەركێ دراڤی |
| Flutuations | التقلب – التارجح | باركوهۆرین |
| Flutuations | التقلبات | بارگۆران (هاوچەرخان) |
| Trade (Business) Cycle | الدورة الاقتصادية | پاركوهۆرینێن ئابووری |
| The Labour Conditions | ظروف العمل | باردۆخێ كاری |
| The Market | الاسواق | بازار |
| Free Competition Market | سوق المنافسة التامة | بازارێ پێشبركیا تمام |
| Internationalization | العالمية | ب جهئینان بوون |
| Implementtation | الانجاز | ب دەستڤە هاتی |
| Avaiable | المتاح | بەردەست |
| Producers | المنتجين | بەهەم هێنەر |
| Full Employment | الاستخدام الكامل | بكارخستنا تەمام |
| Consumers | المستهلكين | ب كاربەر |

| زمانێ ئینگلیزی | زمانێ عەرەبی | زمانێ کوردی |
|---|---|---|
| Banks | البنوك | بەنك |
| Trade Banks | البنوك التجارية | بەنكا بازرگانی |
| Central Banks | البنوك المركزية | بەنكا ناڤەندی |
| World Bank For Reconnstruction& Developmet | البنك المركزي للتعمير و التنمية | بانکا نیڤ دەولەتی بۆ ئاڤەدانكرن و پەرەپێدانێ |
| Value and the price | القيمة و السعر | بها و نرخ |
| Value in exchange | القيمة التبادلية | بهایێ پێکگوهۆرینێ |
| Value in use | القيمة الاستعمالية | بهایێ ب کارئینان |
| Choice | الخيار | بژارە |
| Basis Basics | الاسس/ القواعد | بنەما/ رێسا |
| The factors of production | عناصر الانتاج | بنەمایێن بەرهەمهێنانێ |
| Recession | الركود/ الانكماش | راوەستان و داکێشان |
| Justifiucation | تبرير | بەهانە |
| Theory | النظرية | بیردۆز |
| Demand Shift Theory | نظرية تحول الطلب | بیردۆزا ڤەگوهاستنا خواستی |
| Inflation theories | نظريات التضخم | بیردۆزێن هەلاوسان |
| Cost push theory | نظرية دفع التكاليف | بیردۆزا تێچوونا پالنەران |
| Structural inflation theory | نظرية الهيكلية | بیردۆزا پەیکەری |
| Demand pull theory | نظرية جذب الطلب | بیردۆزا راکێشانا خواستی |
| Job Searching theory | نظرية بحث عن العمل | بیردۆزا گەریان ل دویڤ کاری |
| Marginal utility theory | نظرية المنفعة الحدية | بیردۆزا کەلکێ سنووردار |
| Unemployment | البطالة | بێکاری |
| Voluntary unemploy ment | البطالة الاختيارية | بێکاریا ب ئارەزوو |
| Cyclical unemploy ment | البطالة الدورية | بێکاریا خولی |
| Unemploy ment frictional | البطالة الاحتكاكية | بێکاری بەیەکدان |
| Unemploy ment structural | البطالة الهيكلية (البنيانية) | بێکاریا پەیکەبەند |
| Behavioral Unemployment | البطالة السلوكية | بێکاریا رەفتاری |
| Disguised Unemploy ment | البطالة المقنعة | بێکاریا ڤەشارتی |
| Imported | البطالة المستوردة | بێکاری هاوردە |

| زمانێ ئینگلیزی | زمانێ عەرەبی | زمانێ کوردی |
|---|---|---|
| Seasonal Unemploy Ment | البطالة الموسمية | بێکاریا وەرزی |
| Neutral | المحايد - الحيادي | بێ لایەن |
| Insurance | التامين | بیمە |
| Characteristics | الخصائص / خصوصية | تایبەتمەندی |
| Money Characteristics | خصائص النقود | تایبەتمەندیێن دراڤی |
| Electronic Fund Transfers | التحويلات المالية الاكترونية | رەوانەکرنێن دراڤی ئەلیکترۆنی |
| Balance of payments | ميزان المدفوعات | ترازیا پێدانا |
| Allocation | التخصيص | تەرخانکرن |
| Effeciency | الكفاءة | ژێهاتی |
| Economic Effecincy | الفاعلية الاقتصادية | توانستیا ئابووری |
| Searching Research | البحث | ڤەکولین |
| Costs | التكاليف | تێچوون |
| Classification | التصنيف | پۆلین |
| Motives Motivation | الدافع | پالدەر |
| Engine of growth | المحرك للنمو | پاڵنەرێ گەشەکرنێ |
| Relationship | العلاقة | پەیوەندی / هەڤبەندی |
| Quantitive Relationship | العلاقة الكمية | پەیوەندیا برداری |
| Operation Process | العملية | پرۆسە کریار |
| Application | التطبيق | پراکتیزەکرن |
| Interdependence | الاعتماد المتبادل | پشت گرێدانا پێکهوڕینێ |
| Planning | التخطيط | پلاندانان |
| (Wants (Needs | الحاجات | پێدڤی |
| Holy | مقدس | پیرۆز |
| Expect Predict | التوقع - التنبؤ | پێشبینی کرن |
| Recommendation | المقترح - المقترحات | پێشنیاز پێشنیار |
| Criteria Standard | مقياس ، معيار | پیڤەر |
| Wants Needs | الحاجات | پێدڤی |
| The Types Of Markets | اشكال السوق | جۆرێن بازار |
| Types Of Unemployment | امواع البطالة | جۆرێن بێکاریێ |

| زمانێ ئینگلیزی | زمانێ عەرەبی | زمانێ کوردی |
|---|---|---|
| The Types of inflation | انواع التضخم | جۆرێن هەڵاوسان |
| Portfolio | المحافظ المالية (الاستثمارية) | جافانێ دارایی |
| Exution Exute | التنفيذ | ب جهئینان |
| Alternatives | البدائل / البديل | جهگر |
| Globalization | العولمة | جیهانگیری |
| Preferring | التفضيل | حەزکرن |
| Welfare | الرفاهية | خۆشژیار |
| Expenditure Spend | الانفاق | خەرج-خەرجکرن |
| Services | الخدمات | خزمەت-خزمەتگوزاری |
| Supply | العرض | خستەروو |
| Tables Scheduales | الجداول | خشتە |
| Study | الدراسة | خویندن |
| Intra Firm | تقسيم العمل في السلعة الواحدة | دابەش کرنا دناڤ ئێك شمەکیدا |
| Intra Industry | تقسيم العمل في الصناعة الواحدة | دابەش کرنا کاری دناڤ ئێك جۆرێ پیشەسازیدا |
| Distribution | التوزيع | دابەشکرن |
| Financial Resources | الموارد المالية | دەرامەتێن دارایی |
| Natura Resources | الموارد الطبيعية | دەرامەتێن سروشتی |
| Human Resources | الموارد البشرية | دەرامەتێن مرۆڤی |
| Intervien | التدخل | دەستێوەردان |
| Scarcity Scarce | الندرة / لنادرة | کێم هەیی/ کێم هەبوونا |
| Conflict | متعارض | دژی ئێك / هەڤدژ |
| Money | النقود | دراڤ |
| Mooney as a medium of exchange | النقود و سيطاً للتبادل | دراڤ وەك ناڤەندەکێ |
| Money Deposits | نقود الودائع | دراڤێ (دراڤێ سپاردەکان) بەنکی |
| Exlectronice Money | النقود الاكترونية | دراڤێ ئەلیکترۆنی |
| Plastic Money | النقود البلاستيكية | دراڤێ بلاستیکی |
| Full bodied money | النقود القياسية | دراڤێ پیڤەری |
| Digital or E-Money | النقود العددية | دراڤێ هژمارەیی |

| زمانی ئینگلیزی | زمانی عەرەبی | زمانی کوردی |
|---|---|---|
| Commodity money | النقود السلعية | دراڤێ شمەکی |
| Paper money | النقود الورقية | دراڤێ کاغەزی |
| Metal money | النقود المعدنية | دراڤێ کانزایی |
| Credit money | النقود الائتمانية | دراڤێ باوەری پێدان |
| Differentiation | المفاضلة | دڵخوازکرن |
| Redistribution | اعادة التوزيع | دووباره دابەشکرن |
| Actors | الفاعلين | دووبەر |
| Exposure | التعرض | تووشی |
| Economic Rationality | العقلانية | ژیری |
| Rationality | العقلانية – الرشادة | ژیری |
| Labour unions the role of | دور نقابات العمال | رۆلێ سەندیکایێن کرێکاران |
| Adjustment | التعديل – التسوية | راست کرن چارەسەر |
| Behavior | السلوك | رەفتار |
| Obsulute | المطلق | بێ سنوور |
| Transfers | التحويل | رەوانەکرن |
| Events | الاحداث | رووبدان |
| World trade organization | منظمة التجارة العالمية | رێکخراوا بازرگانیا جیهانی |
| Organization-Entrepreneur | التنظيم – المنظم | رێکخستن-رێکخەر |
| Concept | المصطلح – الاصطلاح | زاراڤ |
| Economics | علم الاقتصاد | زانستێ ئابووری |
| Informations | المعلومات | پێزانین |
| Data | البيانات | زانیاری |
| Land | الارض | ئەرد |
| Resources | الثروة/ الموارد | سامان/ دەرامەت |
| Liberalism | الليبرالية – التحرر | سەربەخۆیی ئازادی |
| Recent | المعاصر | سەردەم / هەڤچەرخ |
| Capital | راس المال | سەرمایە |
| Productive Capital | راس المال الانتاجي | سەرمایێ بەرهەمهێن |
| Revenue Capital | راس المال الايرادي | سەرمایێ داهاتی |

| زمانێ ئینگلیزی | زمانێ عەرەبی | زمانێ کوردی |
|---|---|---|
| Real capital | راس المال الحقيقي | سەرمایێ راستەقینە |
| Monetary capital | راس المال النقدى | سەرمایێ نەختینی |
| International Monetary Fund | صندوق النقد الدولى | سندووقا دراڤێ نیڤ دەولەتی |
| Marginal Flexible | الحدية / الحدي | سنووردار سنورەکی |
| Interest | الفائدة | مفا |
| Economic Policy | السياسة الاقتصادية | سیاسەتا ئابووری |
| foreign trade policy | سياسة التجارة الخارجية | سیاسەتا بازرگانیا دەرڤە |
| Fiscal policy | السياسة المالية | سیاسەتا دارایی |
| Fiscal & Expenditure policy | السياسة المالية و الانفاقية | سیاسەتا دارایی و خەرجی |
| Monetary policy | السياسة النقدية | سیاسەتا نەختینەیی |
| Mixed economic system | النظام الاقتصادي المختلط | سیستەمێ ئابوورێ تێکەل |
| capitalist economic system | لنظام الاقتصادي الراسمالي | سیستەمێ ئابوورێ سەرمایەداری |
| Socialist economic system | النظام الاقتصادي الاشتراكي (الموجه ، او المخطط) | سیستەمێ ئابوورێ سوسیالیستی (ئاراستەکری ، یا پلاندانەر) |
| Natural Law | النظام الطبيعي | سیستەمێ سروشتی |
| Skills | المهارة | شارەزایی -بەهرمەندی |
| Barter | المقايضة | تشت ب تشت -گۆرینا شمەك بە |
| Analysis | التحليل | شرۆڤەکرن |
| Failure | الفشل | شکەست هێنان |
| Commodity Good | السلعة | شمەك |
| Economic effects | الاثار الاقتصادية | شونوارێن ئابووری |
| social & psychology effects | الآثار الاجتماعية و النفسية | شوونوارێن کۆمەلایەتی و دەروونی |
| Formulas | الصيغ الرياضية/ الصيغ الذاتية | شێوازێ بیرکاری شێوازێ خۆیەتی |
| Automotive | بصورة الذاتية | شێوێ خۆیەتی |
| Economic activities | الانشطة الاقتصادية | چالاکیێن ئابووری |
| Activities | الانشطة | چالاکی |
| Control | الرقابة | چاڤدێریکرن |

| زمانی ئینگلیزی | زمانی عەرەبی | زمانی کوردی |
|---|---|---|
| Stabilization | التثبيت – الاستقرار | چەسپای (سەقامگیر) |
| Chiques | الشيكات او الصكوك | چەك |
| The concept of value | مفهوم القيمة | تێگەهێ بهای |
| Frame Framework | الاطار | جوار جوڤە |
| Variable | المتغيرات | گوهورین |
| Progress Advancement | التطور | پێشڤەچوون |
| Importance | اهمية | گرنگی |
| Profit | الربح | قازانج |
| Multi national companies | الشركات المتعدية القومية او الجنسية | کۆمپانیا فرە رەگەز |
| Labour | العمل | کار |
| Credit Cards | البطالقات الائتمانية | کارتێن باوەری پێدانێ |
| Effect | تاثير | کارتێکرن |
| Effect | التاثير | کاریگەری |
| Multiplier effect | اثر المضاعف | کاریگەری دوو هێندە |
| Private sector | القطاع الخاص | کەرتێ تایبەت |
| Public sector | القطاع العام | کەرتێ گشتی |
| Personal Individual | الفردية او الشخصية | کەسایەتی تاکرەوی |
| Accvantage Utility | التراكم / يتراكم | کەڵەکەبوون |
| Rent | المنفعة | کەڵك |
| Wage | الايجار | کریا خانی |
| Lack | الاجر | کریا کاری |
| Competition | قصور | کورت هێنان |
| Problems Issues | المنافسة | كێبركێ ركەبەری |
| Logic | المشاكل | کێشە گرفتە |
| Special drawing righte | حقوق السحب الخاصة | مافێ راکێشانا تایبەت |
| Long run | الاجل الطويل | ماوێ درێژ فەکێش |
| Purpose | الغرض | مەرەم |
| Conditions | الشرط – الشروط | مەرج |
| Credit | الائتمان | باوەری پێدان |

| زمانێ ئینگلیزی | زمانێ عەرەبی | زمانێ کوردی |
|---|---|---|
| Ownership | الملكية | موڵکداری |
| Elasticity Flexible | المرونة – المرن | نەرمی نەرمی نواندن |
| Price | السعر | نرخ |
| Price maker | صانع للسعر | نرخ دروستکەر |
| Price maker | متلقي للسعر | نرخ وەرگر |
| Equilibrium price | سعر التوازن | نرخێ هەڤسەنگی |
| Dunmping | الاغراق | نقووم بوون |
| In put out put models | نموذج المسخدم المنتج | نموونا بکارهێنەرێ-بەرهەمهێنەر |
| Political Factor | العوامل السياسية | هۆکارێن رامیاری |
| Social facters | العوامل الاجتماعية | هۆکارێن کۆمەلایەتی |
| Causes of unemployment | مسببات البطالة | هۆکارێن بێکاریێ |
| Accomdating payments | مدفوعات الموازنة | هەڤسەنگیيا هاتیە پێدان |
| Aquations | المعادلات | هەڤ کێش |
| Inflation | التضخم | هەلاوسان |
| Creeping Inflation | التضخم الزاحف | هەلاوسانا خشۆك |
| Stagflation | التضخم الركودي | هەلاوسانا داکێشانێ |
| Suppressed Inflation | التضخم المكبوت | هەلاوسان ڤەشارتی |
| Hyper Inflation | التضخم المفرط او الطليق | هەلاوسانا دەست بەرد |
| Selections | اختيارات | هەلبژاردە |
| Selection | الاختيار | هەلبژاردن |
| Physical | القوة الجسدية | هێزا جەستەیی |
| Mental | القوة الذهنية | هێزی زەینی |
| Labor force | القوى العاملة | هێزی کاری |
| Aware | الوعي | هشیاری |

# ليستا كورتكريان

| کورتکرن | زاراڤ ب زمانی | |
| --- | --- | --- |
| | ئینگلیزی | کوردی |
| AC | Average Cost | ناڤەندیٚ تێچوونیٚ |
| AR | Average Revenue | ناڤەندیٚ داهاتی |
| DD | Demand Curve, Demand | داخواست چەمیاییٚ داخواستی |
| GATT | General agreement for tarrifs & Trade | گرێبەستێن گشتی بۆ تاریفیٚ و بازرگان |
| ILO | International labour organization | رێکخراوا کاریٚ نیڤ دەوڵەتی |
| IMF | International Monetary fund | سندووقا دراڤیٚ نێوەدەوڵەتی |
| MC | Marginal Cost | تێچوونا سنووردار |
| MR | Marginal Revenue | داهاتیٚ سنووردار |
| MNCS | Multi National Companies | کۆمپانیا فرە رەگەز |
| P | Price | نرخ |
| Q | Quantity | بڕ |
| SDR | Special drawing rights | مافی راکێشانا تایبەت |
| SS | Supply Curve, supply | خستە روو / چەمیایٚ خستە روو |
| TAC | Total average cost | سەرجەمیٚ ناڤەندیٚ |
| UNDP | United nations development programe | بەرنامیٚ پەرەپێدانا ویلایەتێن ئێکگرتی |
| WB | World Bank | بەنکا نێڤ دەوڵەتی |
| WTO | World trade organization | رێکخراوا بازرگانیا نیڤ دەولەتی |

# ناڤەڕوك